3

له بڵاوكراوەكانی سەنتەری حیكمە



# لەبەركردنی قورئانی مەزن

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

نوسینی

غەریب عەزیز

چاپی سێیەم

2009ز - 1430ك

زنجیرەی بەرەو بەهاری قورئان

بەرگی دووەم

# لەبەرکردنی قورئانی مەزن

نووسینی

غەریب عەزیز

پێداچوونەوەی

دەستێک لە مامۆستایانی سەنتەری حیکمە

ناوی کتێب: لەبەرکردنی قورئانی مەزن

نوسەر: غەریب عەزیز

پێداچوونەوەی: دەستەیەك لە مامۆستایانی سەنتەری حیکمە

چاپی یەکەم: 2008 - 1429 - 2708

چاپی دووەم: 2009 - 1430 - 2709

تیراژ : 2000 دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (1730) ی ساڵی 2008 دراوەتێ

---

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ
يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الإسراء

﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ
بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ العنكبوت

# پێشکەش

## پێشکەش بێ:

- بەو ئیمانـدارە تێکۆشـەرانەی کـە هـەردەم بـە مـاڵ و بـە گیـان ئامادەن بۆ بەرگری کردن لە قورئان.
- بەو ئیماندارە خۆشەویستانەی کە هەموو قورئانیان لە سـینگدایەو دڵنیان کە خوای گەورە لەمە گەورەتر و بەنرختری پێ نەبەخـشیون، وەبەردەوام خەریکی پێداچوونەوەو خـۆ شـارەزاکردن و بەرجەسـتە کردنی قورئانن لە ژیانی ڕۆژانەیان.
- بەو ئیماندارە بەڕێزانەی هەروەکو چـۆن لـە خـەمی دونیایانـدان ئـاواش - بـەڵکو زیـاتریش - لـە خـەمی دوارۆژو قیامەتیانـدان و بەشێک لە هەموو ڕۆژێکی ژیانیان تەرخان دەکەن بۆ لەبـەرکردن و زیاتر پەی بردن بە دەریای پڕ نهێنی و زانیارییەکانی قورئان.

# سوپاس و پێزانین

1- بۆ مامۆستایانی سەنتەری حیکمە کە لە پێداچوونەوەی کتێبەکە ئەرکیان کێشا، وە بۆ ئەو تێبینی و پێشنیارە جوان و رێك و پێکانەی لەم بارەیەوە هەیانبوو، وە لەسەروویشیانەوە مامۆستا ئەبوبەکر بەرێوبەری سەنتەر.

2- بۆ برای بەرێز و شاعیر کاك فەرهاد جەوهەر برادۆستی کە داوام لێ کرد چەند چوارینە شعرێك بۆ هێندێك لە بابەتەکانی کتێبەکە بنووسێ.

3- بۆ کاك سەرکەوتی برام کە بە کومپیوتەر هەستا بە دانانی ئایەتەکان بەشێوەی موصحەفی مەدینە.

4- بۆ مامۆستا شێخ نیاز دێگەیی کە لەسەر داوای وەزارەتی ئەوقاف پێداچوونەوەی کردو ئەرکی کێشا.

5- بۆ هەموو ئەوانەی بە هەر جۆرێك دەست بارو هاوکار بوون و یارمەتیان دام.

بە هەموو ئەوانەی باسم کردن دەڵێم: خوای گەورە پاداشتی چاکەتان بداتەوەو بیکاتە زەخیرەی قیامەتتان.

# پێشکەش کردن

الحمـدلله الـذي خلـق الـسماوات والأرض وجعـل الظلمـات والنـور، القائـل: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ وَسَوۡفَ تُسۡـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾، والصلاة والسلام على البـشير النذير القائل: ( ما من نبي الا وقد أعطي ما آمن على مثله البـشر وإنما كـان الذي أوتيته وحياً أوحاه الله إلي فأرجوا أن أكون أكثرهم تابعـا )[1]، وعلـى آلـه وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

وبعد:

لەبەرکردنی قورئـان و خـۆ شـارەزا کـردن و ووردبوونـەوە لێـی شـەرەف و گەورەییەکــە دەبێتــە بەشــی کەســانێك کــە خــوا خۆشــی دەوێــن و هەڵیبژاردوون و چاکەی بۆ ویستوون، وەکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (أهل القرءان هم أهل الله وخاصته)، وە دەفـەرموێ: (مـن يـرد الله به خيراً يفقهه في الدين).

جا ئەمەش بۆ هەر کەسێك ئاسان دەبێت کە نیەتی لێ بێنێـت و بـازووی لێ هـەڵبکات، چونکە ئـەم قورئانـە هـەروەکو چۆن خوێندنـەوەی ئاسـان کـراوە وەکـــو خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر، بەهـەمان شێوە تێگەیشتن لێـی و لەبەرکردنیـشی ئاسـان کـراوە. وە لەبـەرکردنی قورئـان یەکێکـە لـە سـیفەتەکانی ئـەم ئوممەتـە، بەتایبەتی ئەوانەی زانا و شـارەزان وەکـو خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ ﴾ العنكبـوت (49)، وە هــەروەکو لــە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە: (إني مبتليك ومبتل بك، ومنزل عليك كتابا

---

(1) رواه أحمد والبخاري ومسلم.

لا يغسله الماء تقرؤه نائماً ويقظان)[1] مەبەست لە كتاباً لا يغسله الماء ئەوەیە کە ئەگەر وەکو پەرتوکیش نەمێنێت، بەڵام لە ناو دڵەکان دەمێنێت و ناسڕێتەوە و ڕەش نابێتەوە. وە یەکێ لە سیفەتەکانی ئەم ئوممەتە کە لە کتێبەکانی پێشتر هاتووە ئەوەیە: (أناجيلهم في صدورهم).

ئەم کتێبەی (مامۆستا غەریب) یش کە بەرگی دووەمە لە زنجیرە کتێبی (بەرەو بەهاری قورئان)، بەرهەمێکی جوانە لەم بارەیەوە و زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی هەموو ئەو بابەتانەی خستۆتە ڕوو کە تاکی مسوڵمان پێویستی پێیەتی بۆ لەبەرکردنی قورئانی بەرز و بەڕێز، لە یەکەم هەنگاوەوە تا دوا قۆناغ.

ئێمەش وەکو دەستەی مامۆستایانی سەنتەر پێیداچوینەتەوەو زۆر بە پێویستمان زانیوە کە چاپ بکرێت و بڵاوبکرێتەوە بۆ ئەوەی هەرچی زووتر خەڵك سوودمەند بن لێی، وە هانی گشت مسوڵمانان دەدەین بە تایبەتی قوتابیانی قورئان کە گرنگی بەم کتێبە بدەن و سوودی لێ ببینن. بەهیوای ئەوەی ئەم پەرتوکە ببێتە هاندەرێك و ڕێبەرێك بۆ لەبەرکردنی قورئان، وە ببێتە هۆکارێك بۆ شکاندنی کۆت و پێوەندەکان و لابەری لەمپەرەکان.

خوا پاداشتی بەچاکتری مامۆستا غەریب بداتەوە لەسەر ئەم هەوڵ و خۆ ماندووکردنەی، خوا ئێمە و ئێوەش سەرکەوتوو بکات لە دونیا و سەرفرازمان بکات لە ڕۆژی دوایی.. آمـیـن.

ئەبوبەکر قادر موستەفا

**بەڕێوەبەری سەنتەری حیکمە**

**بۆ فێرکردن و پێ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز**

**28/شەوال/1429 – 2008/10/27**

---

(1) رواه مسلم.

# پێشەکی

بەناوی خوای بە بەزەیی و میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ خوای بەتوانا، درود و سەلام بۆ سەر پێغەمبەری پێشەوا.

بەڕاستی تاقە مەبەستێك كە ئیماندار هەوڵی بۆ دەدا ئەوەیە كە پەروەردگار لە خۆی ڕازی بكاو ڕێزو شكۆمەندی و پاداشتی زۆر لە دواڕۆژدا بەدەست بێنێ. بۆ ئەمەش پەروەردگارمان ڕێنموونی كردووین بۆ ئەو ڕێگایانەی كە ئەو پێی خۆشە و لە ڕەزامەندی و پەرستن و فەرمانبەری ئەودایە، لە هەمووشیان مەزنتر ڕوو لە قورئان كردنە بە خوێندنەوەو لەبەركردنی، تا وورد بوونەوەو كارپێ كردنی. خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾ ﴾[1].

وەهەروەها چەندان فەرمایشتی پیرۆزی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم باس لە گەورەیی و شەڕەف و شكۆمەندی و شەهامەتی ئەهلی قورئان دەكەن، كە هەموو ئەمانە پاڵنەرو هاندەرن بۆ ئێمە تا زیاتر دەرگای سینگمان بۆ قورئان والآ بكەین و لە دڵدا جێگەی بۆ بكەینەوە.

ئەگەر سەیری پێشینانی خۆمان بكەین و ژیانیان بخوێنینەوە سەرسام دەبین و ئینجا دەزانین كە چەندە گرنگیان بە قورئان داوەو لە هەوڵی سەرخستنی دابوون، تەنانەت لەپێناو بەرز كردنەوەیدا ئەزیەت و

---

(1) سورة فاطر (29– 30).

ئازاری زۆریـان چەشتووە و گیانی خۆشیان خستۆتە مەترسی، وە هیچ کاتێکیش لـە ترسـی بەرامبـەرەکانیان، لـە ئیمـان و بیروباوەڕیـان پاشـگەز نەبوونەتەوەو دەستیان لە قورئان هەڵنەگرتووەو ڕوویان لـە بـەرەی کـوفر و دوژمنانی ئیسلام نەکردووە. ئەوەتا یەکەم کەسێك لە مەککە – لـەو کاتـەی مـــسوڵمانان زۆر بێدەســـەڵات بـــوون– لـــە بەرامبـــەر بێبـــاوەڕان لـــە خوێندنـەوەی قورئانـدا دەنگـی هـەڵبڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعود بـوو ڕەزای خوای لێ بێ، دەگێڕنەوە:

( ڕۆژێکیـان هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا لـە کۆبونەوەیەکیانـدا گوتیـان: سـوێند بـەخوا تـا ئێـستا هـیچ کـەس ئـەم قورئانـەی لـەلای قورەیـشیەکان بەدەنگ نەخوێندۆتەوە، جا چ پیاوێك هەیە بچێ ئەم کارە بکاو قورئانیان بۆ بخوێنێتەوە تا بیبیستن؟

عەبدوڵڵا گوتی: من.

ئـەوانیش گوتیـان: ئێمـە دەترسـین لێـت. بـەڵکو پیاوێکمـان دەوێ عەشیرەت و شان و شەوکەتی هەبێ تا لە ئەزیەتی ئەوان قەدەغەی بکاو بیپارێزێ.

عەبـدوڵڵا گـوتی: لـێم گـەڕێن خـوای گـەورە لـە ئەزیـەتی ئـەوان قەدەغـەم دەکات.

بـەیانی لـەکاتی چێـشتەنگاو عەبـدوڵڵا ڕۆیـشت بـەرەو لای مـەقامی ئیـبراهیم کـە نزیـك بـوو لـەنادی و شـوێنی دانیـشتنی قورەیـشیە بێباوەڕەکان، ئینجا عەبدوڵڵا دەستی بە قورئان خوێندنەوە کرد:

﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ﴿٤﴾﴾[1].

وەلەگەڵیدا ڕووی لەوان کردو دەنگی بەرز کردەوە.

بێ باوەڕانیش لە عەبدوڵڵا ڕامان و گوتیان: ئەوە چی دەڵێ؟

پاشان گوتیان: ئەوە بەڕاستی ئەوە دەخوێنێتەوە کە موحەممەد هێناویەتی. ئیدی هەستان کەوتنە سەری و زۆر ئەزیەتیاندا. عەبدوڵڵاش لە خوێندنەوەکەی تا توانای هەبوو بەردەوام بوو.

پاشان عەبدوڵڵا بە لەشی ئازار و دەم و چاوی بە برینەوە گەڕاوە لای هاوەڵەکانی.

ئەوانیش پێیان گوت: ئاخر لەوە دەترساین!

عەبدوڵڵا گوتی: ئێستا دوژمنانی خوا زۆر زیاتر لەجاران لەلای من بێ سەنگ و کەمترن، وەئەگەر دەتانەوێ بەیانیش وەکو ئەمڕۆ دەچمەوە لایان.

گوتیان: نا بەسە، بەڕاستی ئەوەی پێیان ناخۆش بوو بۆت خوێندنەوەو بیستیان)[2].

ئاشکرایە هەموو ئەمانە و زیاتریش کە کردوویانە لەبەر زۆر خۆشەویستیان بووە بۆ قورئان و فەرموودەی خوا. لە غەزای (ذات الرقاع): ( کۆچەرییەک لەوکاتەی خەوتبوو، برا پشتیوانەکەشی لە نزیکییەوە شەونوێژی دەکرد، پیاوێك لە دوژمنەکانیان کە لە نزیکەوە خۆی مەڵاس دابوو سێ تیری گرتە پشتیوانەکە و هەرسێکی پێکا، پاشان کە پشتیوانەکە چووە کڕنۆش و سوژدە ئینجا هاوەڵەکەی بەمەی زانی

---

(1) سورة الرحمن (1-2).

(2) سيرة ابن هشام باب أول من جهر بالقرآن عبدالله بن مسعود وما ناله من قريش في سبيل جهره بالقرآن (275/1).

**دوژمنەکە کە زانی دەستیان شکا بەسەریدا و خەریکە دەیگرن، هەڵات.**

**ئیدی کۆچەرەکە کە دیتی وا برا پشتیوانەکەی خوێنی لێ دەچۆڕێ، پێی گوت: پاك و بێگەردی بۆ خوا ئایا نەدەبوو لە یەکەم تیر منت ئاگادار کردبووایەوە؟**

**پشتیوانەکە گوتی: لەوکاتەدا لەخوێندنەوەی سوڕەتێکدا بووم حەزم نەکردو پێم خۆش نەبوو بیبڕم تا تەواوی دەکەم).**

**بەڵێ؛ تا دونیا بەدونیایە خەڵکان قەرزاری ئەو کەڵە پیاوانەن و لەبەر جوامێری و مەردایەتیان ناویان لەلاپەڕە زێرینەکانی مێژوو تۆمارکراوە و باسیان بەچاکە کۆتایی نایەت.**

**کەواتە: یەکەم کارێك لەسەر ئیماندار پێویست بێ و هەڵبستێ بە جێبەجێ کردنی بریتیە لە هەوڵدان بۆ شارەزا بوون و لەبەرکردنی قوڕئان، ئەمەش بە وەرگرتنی ووشە و ئایەتەکانی لە دەمی هەڵگرانی، وە زانینی واتایەکانی لە ئەهلی زیکر و زانایانی، وە مانەوەو گەڕان لە مێرگ و بەهاری قوڕئان بۆ چنین و بەدەسك کردنی گوڵ و گوڵزاری شەڕەف و شکۆمەندی و کردنی بە ملوانکەی ڕێزو سەربەرزی و پاشان لە گەردەن و مل کردنی، بۆ ناسینەوەو جیاکردنەوەی لە بێدین و دوژمنانی.**

**ئیتر لە خوای گەورە و باڵادەست نزا دەکەم و داواکارم کە قوڕئان بکاتە بەهاری دڵمان و زیاتر خۆشەویستی بکا لە لامان و لە لەبەرکردن و وورد بوونەوە لە ئایەتەکانی و پاراستنی سنوورەکانی توانای زیاترمان پێببەخشێ و لەو کەسانەبین کە لە ڕۆژی دوایی تکامان بۆ دەکا و شکایەتمان لێ ناکا. آمین.**

**نوسەر**

**کوردستان – هەولێر**

**هاوینی 2000 ز – 1421 ك**

# ڕێ خۆشکردن

**لە سەرەتادا چەند تێبینییەکی پێویست:**

**1- هەندێك لەو فەرموودانەی لەم زنجیرەیەدا هاتوون و لە لایەن هێندێك زاناوە بە بێ هێز (ضعیف) لە قەڵەم دراون، بەڵام لە لایەن هێندێکی تر تەحقیق و تەخریجی تریان بۆ کراوە و گەیاندوویانەتە پلەی (حسن) یان (صحیح) ئێمەش هێناومانەتەوە و ئاماژەمان بە چۆنیەتی تەخریجەکەشی کردووە.**

**2- لەبەرئەوەی نوسینی ئەم زنجیرە پەرتووکە زادە و هزری مرۆڤە، بۆیە کەم و کورتی و هەڵەی لەوانەیە تێدا بێت، چونکە ئەوەی بێ لەکە و هەڵە بێت تەنها کتێبی خوای گەورەیە[1]. جا لە بەڕێزتان داوا کارم بە گەورەیی خۆتان لە هەبوونی هەر هەڵەیەك ئاگادارمان بکەنەوە، منیش لە لایەن خۆمەوە لە هەبوونی ئەو هەڵانەی هەستم پێ نەکردوون و لەگەڵ شەریعەتی خوا تێك دەگیرێن پەشیمانم.**

**پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە هەڵوێستی ئێوە بەرامبەر من و هەر مسوڵمانێکی تر دەفەرموێت: (الْمُؤْمِنُ مِرآةُ الْمُؤْمِنِ**

---

(1) خوای گەورە سەبارەت بە کتێبی خۆی دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾﴾ النساء -82-.

**وَالْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ يَكُفُّ عنه ضَيْعَتَهُ وَيَحُوطُهُ مِنْ وَرَائِهِ)** [1].

**واتە: (ئیماندار ئاوێنەی ئیمانداره، برای ئیمانداره، کاروبارەکانی ژیانی بۆ کۆدەکاتەوه و یارمەتی دەدا، وه لەپاش ملە بەرگری لێ دەکا و دەیپاریزێ و به خراپه باسی ناکا).**

**3- هەموو ئەو سەرچاوانەی سوودم لێ وەرگرتوون بۆ ئامادەکردنی ئەم زنجیرەیە کە لە پێنج بەرگ پێك هاتووه-إنشاء الله- لە بەرگی کۆتایی ئامارژەیان پێ دەکەین.**

**4- ئەم زنجیرەیە جگە لە بەرگی سێیەم چەند ساڵێك بەر لە ئێستا نوسراوەو کۆکراوەتەوه، بەڵام ئەوەندە هەیە پێداچوونەوەی بۆ کراوەو لێی کەم و زیاد کراوە.**

---

(1) رواه أبو داود (4918)، وابن وهب في الجامع (ص37)، والبخاري في الادب المفرد (239) من حديث أبي هريرة وإسناده حسن، والطبراني في الاوسط (2135)، والبزار (3297)، والقضاعي في مسند الشهاب (124،125) باسناد حسن من حديث انس رضي الله عنه.

# بەشی یەکەم

## لەبەرکردنی قورئانی مەزن

**خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ١٧﴾[1].**

**قورتوبی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (أي سهلناه للحفظ وأعنّا عليه من أراد حفظه، فهل من طالب لحفظ القرآن فيعان عليه؟).**

**واتە: (ئەم قورئانەمان ئاسان کردووە بۆ لەبەرکردن و ئەوەی بیەوێ لەبەری بکا یارمەتی دەدەین، جا کەس هەیە داوای لەبەرکردنی قورئان بکات تا یارمەتی بدەین و پاڵپشتی لێ بکەین؟).**

**جا لەم بەشەدا لە پێنج (5) خاڵان تاوتوێی لەبەرکردنی قورئانی مەزن و پایەدار دەکەین:**

**خاڵی یەکەم: دەروازە**

**خاڵی دووەم: لەبەرکردنی قورئانی مەزن پێش هەموو کارێک**

**خاڵی سێیەم: فەزڵ و گەورەیی لەبەرکردنی قورئانی مەزن و هەڵگرانی**

**خاڵی چوارەم: قورئان و منداڵ**

**خاڵی پێنجەم: کێ شایستەترە ئیمامەتی و بەرنوێژی بکا؟ ئەوەی قورئانی زیاتر لەبەرە (أقرأ) یان ئەوەی لە فیقە شارەزاترە (أفقه)؟**

---

(1) سورة القمر(17،20،32،40).

## خاڵی یەکەم: دەروازە

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١ ﴾[1].

واتە: ( وە لەخودی خۆشتاندا- بەڵگەی زۆر هەیە- دەی ئایا بۆ وورد نابنەوەو سەرنج نادەن ).

بە پێویستی دەزانم لە خودی خۆمان لە سێ (3) بابەت باسی هێندێك لەو ئەندامانە بکەم کە بەشدارن لە خەزن کردن و عەمبار کردنی ووشە و ئایەتەکانی قورئانی مەزن تا بزانین خوای گەورە چ توانا و هێزێکی وا سەیرو سەرسوڕهێنەری بەو ئەندامانە بەخشیوە کە دەتوانن زۆر زیاتر لە قورئان خەزن بکەن و هەڵیبگرن، تەنانەت زۆر بەئاسانیش، بەڵکو زانایان لە تواناو هێزی خەزن کردن لای مرۆڤ باس لە شتێك دەکەن کە لەوانەیە بەلای هێندێك کەس ئەوە خەیاڵ بێت. بەڵام واقیع و مێژوو ئەوەی سەلماندووە، هەروەکو لەم کتێبەدا چەند نموونەیەکت- بەویستی خوا- بەرچاو دەکەوێ.

بەڵێ: ئەگەر بەپێی ئەو زانیارییانەی لە زانستی پزیشکی و لێکۆڵینەوەکاندا تائێستا دەربارەی مرۆڤ زانیومانە و سەرنجی خودی خۆمان بدەین سەرسام دەبین، وە بە ناچاری و بەبێ ویستی خۆمان- ئەگەر نکۆڵی نەکەین[2]- دان دەنێین بە پەروەردگاریێتی پەروەردگارو خوایەتی خوامان. جا لەم دەروازەیەدا هەریەك لەم سێ (3) بابەتە سەرەتایەکن بۆ ناسینی توانای مرۆڤ بۆ کرداری لەبەرکردن:

---

(1) سورة الذاريات (21).

(2) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٨٣ ﴾النحل.

## بابەتی یەکەم: دەماخ (الدماغ):

ا- دەماخ و مۆخی مرۆڤ نزیکەی یەك کیلۆ و چوارسەد گرام (1.4 کگم) دەبێ لە کەسێك کێشەکەی حەفتا (70) کیلۆ گرام بێ، واتە یەك لەسەر پێنج (1/5)ی کێشی لەش، لەمەوە دەماخی مرۆڤ لەچاو کێشی لاشەکەی بە بەراوود لەگەڵ دەماخی گیانەوەرەکانی تر لەچاو کێشی لاشەکەیان گەورەترین قەبارەی هەیە.

ب- لە دەماخی مرۆڤدا چینێك هەیە پێ ی دەڵێن " توێژاڵ و چینی دەماخ" کە ئەستورییەکەی لە دوو ملیمەتر (2 ملم) تێناپەڕێت و لە چوارده (14) ملیار خانەدەمار پێك هاتووە، ئەو خانەدەمارانە لە کاتی لەدایك بوون ژمارەیان دیاری کراوەو گۆڕانکارییان بەسەر دا نایەت[1].
بەڵام خانەکانی تری لەش بەشێوەیەکی گشتی نزیکەی هەر حەوت (7) ساڵ جارێك نوێ دەبنەوەو دەگۆڕێن، وە هێندێکیان وەکو خانەکانی پەردەی ناوەوەی گەدە هەر چل و هەشت (48) کاتژمێر جارێك دەگۆڕێن.
جا ئەو چینەی دەماخ کە کێشەکەی لە سەد (100) گرام تێناپەڕێت کەچی بەرپرسیارە لە هەستیارترین و مەترسیدارترین ئەرك و فەرمان کە مرۆڤ هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی، وەك: فێربوون و دووبارە هێنانەوەی زانیارییەکان و داهێنان و پێشنیار کردن و بیرۆکە داڕشتن و هەستەکان و جوڵان و بیستن و بینین. وەلەمەش سەیرتر ئەوەیە کە زانا جۆد سۆن هریك دەڵێ:(ئەگەر ئێمە هەموو ئامێرەکانی جیهان لە تەلەفۆن و



---

(1) چونکە ئەگەر ئەم خانەدەمارانە لەناوبچن و نوێ ببنەوەو گۆڕانکارییان بەسەردابێت کەواتە ئێمە هەر چەند ساڵ جارێك ئەوەی لە رابردوو خەزنمان کردووە هەمووی دەسڕایەوەو دووبارە دەهاتینەوە خالی سفرو دەست پێکردن بەخەزن کردنی زانیارییەکان، بەڕاستی ئەم نەگۆڕانەش نیعمەتێکیتری گەورەی خوای پەروەردگارو بە بەزەییەو سوپاسگوزاری زیاتری دەوێ.

تەلەگراف و ڕادارو تەلەفزیۆنەکان کۆبکەینەوە پاشان هەوڵبدەین ئەو هەموو ئامێرە ئاڵۆزانە بەتوانایەکی ئێجگار گەورە و بەهێز لە ئامێرێکدا کۆ بکەینەوە بەجۆرێك قەبارەکەی بگاتە ئەوەندەی قەبارەی دەماخ هێشتا لە ئاڵۆزی یەکەی ناگاتە ئاڵۆزی دەماخ)[1].

ج- دەماخ لە هەر دەقیقەیەکدا پێویستی بە هەزار (1000) مل خوێن هەیە، واتە سەدا بیست(20٪)ی خوێنی لەش، کە دەکاتە یەك لەسەر پێنج (5\1)ی دەرچووی خوێنی دڵ، ئەگەر لەمە کەمتر بێت چالاکی دەماخ بە ئەندازەی کەمی ئەو خوێنەی بۆی دەچێ کەم دەبێتەوە.

د- دەماخ دەتوانێ زیاتر لە دە (10) کاتژمێر بەبەردەوامی و بێپچڕان کاربکات.

هـ- کاریگەری قورئانی مەزن لەسەر دەماخ: زانایان دۆزیویانەتەوە کە لە دەماخدا چوار (4) شەپۆڵ هەیە، وە بۆ هەر شەپۆلێك لە چرکەیەکدا خێراییەکی دیاری کراو و تایبەت هەیە بەم شێوەیە:

**شەپۆلی یەکەم:** لە حاڵەتی زیندوویی و بەئاگایی و جوڵاندا دەماخ بەخێرایی (12- 20 شەپۆل \چرکە) کاردەکات.

**شەپۆلی دووەم:** لە حاڵەتی هێمنی دەروونی و بیرکردنەوەیەکی قوڵدا بەخێرایی (8- 12 شەپۆل \چرکە) کاردەکات.

**شەپۆلی سێ یەم:** لە حاڵەتی هێمنی‌یەکی قووڵ و چوونە ناو نووستن بەخێرایی (یەك شەپۆل \چرکە) کاردەکات.

**شەپۆلی چوارەم:** وە لە حاڵەتی خەوێکی قووڵدا بەخێرایی (0.5- 3 شەپۆل \چرکە) کاردەکات.

---

(1) دەماخ لە چارەسەرکردن و شیکردنەوەی زانیاریەکان خێراترە لە خێرایی تیشك.

جا کاتێك قورئانی بەرز و بەڕێزیان بەسەر پیاوێکی بیانیدا خوێندەوە کە زمانی عەرەبی نەدەزانی و لێی تێنەدەگەیشت دەرەنجامەکەی زۆر سەیر بوو بەجۆرێك شەپۆلەکانی دەماخی بەشێوەیەکی خێرا بۆ ناوچەی (8- 12 شەپۆل \چرکە) دابەزی کە بریتییە لە حاڵەتی هێمنی دەروونی.

## بابەتی دووەم: بیرو هۆش و یاد (الذاکرة):

أ- بیرو زاکیرەی مرۆڤ توانایەکی ئێجگار گەورەی هەیە لە وەرگرتن و خەزن کردنی ملیارەها زانیاری کە هێندێك لە زانایان بە ژمارەیەك و لە تەنیشتییەوە حەفتاو نۆ (79) سفر هەبێ خەملاندوویانە. هەرچەندە مرۆڤ ناتوانێ ئەو هەموو زانیارییە زۆرانەی خەزنی کردوون بیانگەڕێنێتەوە و بیانهێنێتەوە یادی بەڵکو ئەوەی دەتوانێ بیانگەڕێنێتەوە بەسە بۆ پڕکردنی نەوەد (90) ملیۆن کتێبی قەبارە گەورە کە ئەمە ئەوەندەی کتێبەکانی گەورەترین کتێبخانەیە لە جیهان لەسەردەمی ئێستادا[1]. وە ئەگەر ئەم کتێبانە بە تەنیشت یەکەوە ڕیز بکەین هێڵێك دروست دەکەن کە درێژییەکەی چوارسەدو پەنجا (450)

---

(1) جا ئایا بیرو هۆشمان ناتوانێ تەنها شەش سەدوچوار (604) لاپەڕە لە قورئانی مەزن هەڵگرێ و لەبەر بکا؟! (ئەوەتا زانایان دەڵێن: گەر کەسێك کەمترین زیرەکی هەبێ دەتوانێ لەماوەی سەعاتێك لاپەڕەیەك لە قورئانی مەزن لەبەر بکا. کەواتە هیچ مسوڵمانێك بیانووی نامێنێ بڵێ: قورئانم بۆ لەبەر ناکرێ و ناچێتە مێشکم. خۆ ئەگەر لەو زیرەکییەی زانایان دیاریان کردووە تۆ زۆر لەوە کەمترت هەبێ ئەوا هەر چ نەبێ لەماوەی هەفتەیەك- نەوەکو سەعاتێك- دەتوانی پەڕێك لە قورئان لەبەر بکەی. بەڵام ئەگەر خۆمان نەمانەوێ ئەوا خوای گەورەش پێمان ڕەوا نابینێ ﴿يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ ٢٦٩ البقرة.

کیلۆ مەتر دەبێ[1].

ب- مرۆڤ چوار (4) جۆر بیروهۆشی هەیە: بیروهۆشی (بینین و بیستن و بۆنکردن و جولان)، بۆنموونە بیروهۆشی بینین لە مرۆڤێکی ئاسایی دەتوانێ ڕۆژانە نیو (2\1) ملیۆن وێنە لەبیریدا هەڵگرێت و خەزنی بکات، کە لە هەموو ژیانی مرۆڤێکی تەمەن مامناوەندی دەگاتە دەیان ملیار وێنە. وە هەروەها بیرو هۆشەکانی تریش ئاستیان لەمە کەمتر نییە.

ج- کاریگەری قورئان لەسەر بیروهۆش: زانایان دەڵێن: لەبەرکردنی قورئان و پێداچوونەوە و بەبیرخۆ هێنانەوەی بە بەردەوامی گەورەترین شوێنەواری هەیە لەسەر گەشەی بیر و هۆش، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك:

**هۆکاری یەکەم:** یەکێك لە ناو و سیفەتەکانی قورئان ڕۆحە، بۆیە هەرکەسێك بە هەر هۆکارێکی شەرعیانە هەوڵی بەرز ڕاگرتنی قورئان بدا و لە هزرو سینگیدا کۆی بکاتەوە و کاری پێ بکا ئەوا خوای باڵادەست لە ڕۆح و زیندوویەتی ئەم قورئانەی پێ دەبەخشێ و دڵ و دەروون و بیرو هزری گەشە پێ دەدا.

---

(1) ئەگەر سەیری مێژوو بکەین و بڕوانین سەرسام دەبین و ئەو هەواڵە زانستیانەمان لا سەیر نابێ، بۆ نموونە لە ئیبن عوقدە دەگێڕنەوە کە ئەو کتێبانەی نووسیویەتی باری شەش سەد (600) ووشتر دەبوو. وە قازی عبدالرحیمی کوڕی عەلی کتێبە دەست نووسەکانی گەیشتە سەد هەزار (100.000) کتێب. و ئیبنو جەوزی دەربارەی خۆی دەڵێ: ئەگەر بڵێم من بیست (20) هەزار کتێبم خوێندۆتەوە هێشتا زۆر لەوە زیاترە، وە من هەر بەدوای زانیاریدا دەگەڕێم و داوای دەکەم. ئیبنو عەبباس ئەگەر شیعرێکی درێژت بۆ بخوێندبوایەوە ئەوا یەکسەر لەبەری دەکرد و بۆتی دووبارە دەکردەوە. وە چەندان نموونەی تریش لە مێژوودا هەیە و ئەمانەش مشتێکن لە خەروارێك.

**هۆکـــاری دووەم:** قورئـانی مـەزن خـاوەن ڕێکـوپێکی و ئـاوازێکی نـایابـە، ئەمــەش دەبێتــە هــۆی ئــەوەی کــرداری لەبــەرکردن و بــەبیر هێنانــەوەو ڕیزکردنی زانیاری‌یە لەبەرکراوەکان ڕێك بخات.

**هۆکـــاری ســـێیەم:** لەبـەرکردنی قورئـانی مـەزن تـەرکیز و ووردەکـاری دەوێ، کە ئەمە وادەکات بیروهۆش گەشە پێبداو فێری ووردەکاری بکات، چـونکە دروسـت نی‌یـە قورئـان بـە واتایەکـەی لـە جیـاتی دەقەکـەی لەبـەربکرێ، بـەڵکو بـە کـەم کردنـی یـان زیـاد کردنـی پیتێکـیش چ جـای ووشـەیەك یـان زیـاتری نابـێ و قبـوڵ نی‌یــە. ئـەم ووردەکاری‌یــە لــە لەبــەرکردنی پیــت بــە پیتــی قورئانــدا توانایــەکی وورد بــە بیروهــۆش دەبەخشێ و گەشەی پێ دەدا.

**هۆکاری چوارەم:** زۆر پێداچوونەوە (مراجعة)ی قورئان هـەروەکو زانایـان گوتویانە گەشە بە بیروهۆش دەدا. بەواتایەکی تـر: لە پێداچوونەوەدا تـۆ بەردەوام خەریکی کرداری لەبەرکردنی.

**هۆکـاری پێنجــەم:** پەیوەسـت کردن و بەستنەوەی ئایەتـەکان لەشێوەو شــوێن و واتــادا بەیــەکتری قورئانەکــە دامــەزراو و جێگیرتــر دەکــا[1]، وە لەهــەمان کاتیــشدا دەبێتــە هــۆی ئــەوەی بیروهــۆش توانــای وەرگــرتن (إستعاب)ی زیاتر و کراوەتر و فراوانتر بێ بۆ وەرگرتنی زانیاری‌یەکان، وە هەروەها بیروهۆش بپارێزێ لە پەرش و بڵاوی.

د- میکـانیزم و چۆنیـەتی کـاری بیروهـۆش: بەبیرهێنانـەوە بریتی‌یـە لـە ڕاکێشانی زانیاری‌یـەکان لـە بیروهـۆش. بیروهـۆش لەسـەرەتادا لـە ڕێگـەی هەستەکان هەڵدەستێ بە وەرگرتنی زانیاری‌یەکان، ئینجا بـە لەبـەرکردن و

---

(1) لە کرداری لەبەرکردنی قورئانی بەڕێزدا پەیوەندکردن و بەستنەوەی ئایەتەکان بە یەکتری یەکێکە لە بنچینەکانی لەبەرکردنی قورئان.

دانانی لە بیروهۆشی کورت خایەن- کە لەوێدا زانیارییەکان دەسڕێنەوەو نامێنن ئەگەر چەسپ نەکرێن و کاریان لەسەرنەکرێ- ئینجا هەڵدەستێ بە هەڵگرتن و خەزن کردنی لە بیروهۆشی درێژخایەن- کە لەوێدا زانیارییەکان هەندێك جار لەبیر دەکرێن و لەبیر دەچنەوە- جا کرداری خەزن کردن تێرو تەسەل و تەواو نابێ تا حاڵەتی نووستن یان پشووی نێوان دوو کرداری لەبەرکردن ڕوونەدات.

## بابەتی سێیەم: ووزە و توانای مرۆڤ:

بە ڕاستی خوای گەورە لە مرۆڤدا هێز و ووزەیەکی گەورە و مەزنی تێدا دروست کردووە، کە لاشە زیندوو دەکا و بە جووڵەی دەخا، بەڵام بەداخەوە زۆربەی مرۆڤەکان ئەو ووزەیە لە گەمە و گاڵتە و یاری و کاری بێسوود و نابەجێ بەفیڕۆ دەدەن. خوای گەورە ڕۆحی لە ناو مرۆڤدا داناوە و بە هەموو لاشەیدا بڵاوی کردۆتەوە، کە سنوورێك نیە بۆ ووزەکەی، بەڵام مرۆڤ ئەم هێزە ڕۆحیيە لە سەرقاڵی ژیان و دونیا بەزایە دەدا، وەئەگەر مرۆڤ بتوانێ ئەم هێز و ووزە ڕۆحییەی کە هەیەتی کۆیبکاتەوە ئەوە دەتوانێ کاری سەیر و سەرسوڕهێنەر ئەنجام بدا، هەر بۆ نموونە کاتێك ئیماندار دەخەوێ و لە خەوندا ڕۆحی دەچێتە جیهانی باڵا و لەگەڵ فریشتە و پێغەمبەران تەنانەت هێندێك جار لەگەڵ خوای گەورەش دەدوێ هەست بە کامەرانی و خۆشی و بەختەوەری دەکات، وە بۆ شیکردنەوەی ئەمە هیچ تەفسیرێکی زانستی نییە جگە لە زانستی خوای گەورە کە لە ڕێگای پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم بە ئێمە گەیشتووە.

کەواتە هێزو ووزەیەکی شاراوە لە ناخ و ناوەوەی مرۆڤدا هەیە ئەگەر بیەوێ و هەوڵی بۆ بدا- بەویستی خوای گەورە- دەتوانێ بەو هێزە چەندان کار ئەنجام بدا کە خەڵکانێکی زۆر بۆیان ئەنجام نەدرابێ، ئەمەش کاتێک دەبێ ئەگەر تەرکیز و توانای زەین و هێزی دڵ و ڕۆح و هەستەکانی ناوەوە (العقل الباطن) خاڵی بکا لە سەرقاڵی دونیا و بیانبەستێتەوە بە زیکر و یادی خوا و ئەوەی خوا پێی خۆشە، ئەوەتا دەگێڕنەوە[1] کاتێک عومەری کوڕی خەتتاب- ڕەزای خوای لێ بێ- لە مەدینە لەکاتی ووتاردانیدا بانگێکی کردو گوتی: ( یاسارية الجبل، یاسارية الجبل ) کە ساریەی کوڕی زەنیم لەناوچەی خوڕاسان بە هەزارەها کیلۆمەتر لە عومەر دوور بوو، لەوێ ساریە و سوپاکەی دەنگی عومەریان بیست.

---

(1) بۆ درێژەی ئەم ڕووداوە بڕوانە ئەم سەرچاوانە: 1- أسد الغابة لأبن الاثير (1/ 408). 2- الكامل في التاريخ لأبن الاثير (1/ 467). 3- تاريخ الرسل والملوك للطبري (2/ 397). 4-مقدمة ابن خلدون (1/ 50). 5- تاريخ الاسلام للذهبي (1/ 111). 6- البداية والنهاية لأبن كثير (7/ 147).

## خاڵی دووەم:

### لەبەرکردنی قورئانی مەزن پێش هەموو کارێك

لەبەرئەوەی زانایانی پێشین گرنگی و گەورەیی و دەوری قورئانی مەزنیان لە هەموو کارێکدا- بەتایبەتی فێربوونی زانستە شەرعییەکان- دەزانی و بە لوتکەی هەموو زانستیان دادەنا، بۆیە هەر کەسێك نیازی فێربوونی زانستە شەرعییەکانی هەبوایە، دەبوایە لەسەرەتادا قورئانی مەزن لەبەر بکات ئینجا بێتە کۆڕی وەرگرتنی زانست و زانیاری، چونکە هەموو کەس ئامادەیی لەبەرکردنی قورئانی مەزنی نییە کە سەرچاوەی هەموو زانستێکە، وەهەر کەسێکیش ئەو ئامادەییەی تێدا نەبێ- بەتایبەتی دەغەڵو دووڕووەکان لەکاتێکدا دەیانەوێ خۆیان بخزێننە ناو ڕیزی مسوڵمانان- ئەوە شایانی خۆپێوەماندوو کردن و فێرکردنی زانستە شەرعییەکانی تری نابێ.

وەلیدی کوڕی موسلیم ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ( كنّا إذا جالسنا الاوزاعيَّ فرای فينا حَدَثاً قال: يا غلام، قرات القرآن؟ فإن قال: نعم. قال: إقرا: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾ ﴾. وإن قال: لا، قال: اذهب تعلم القرآن قبل أن تطلب العلم)[1].



(1) الحث على حفظ الحديث (ص 70) والجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع (1/ 42) كلاهما للخطيب البغدادي.

واتە:( کاتێك ئێمە لە کۆڕی ئەوزاعی بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری دانیشتباین، وە کەسێکی نوێی لەناوماندا دیتبووایە پێی دەگوت: ئەی گەنج، قورئانت لەبەر کردووە؟

ئەگەر گوتبای: بەڵێ.

ئەوزاعی دەیگوت: ئەم ئایەتە- لەبەر- بخوێنە: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡ ﴾.

وەئەگەر گوتبای: نەخێر، ئەوزاعی پێی دەگوت: بڕۆ پێش ئەوەی داوای زانست بکەی قورئان فێربە و لەبەری‌بکە).

نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (المطالعة بالأهم فالأهم، وأول مايبتدئ بە حفظ القرآن العزيز فهو اهم العلوم وكان السلف لايعلمون الحديث والفقه إلا لمن حفظ القرآن- الى ان قال- وبعد حفظ القرآن يحفظ من كل فن مختصراً ويبدأ بالأهم ومن أهمها الفقه والنحو ثم الحديث والاصول ثم الباقي على ماتيسر...)[1].

واتە: (موتالاکردن و خوێندنەوە بە گرینگترین پاشان گرینگتر دەست پێدەکرێت، وەیەکەم کارێك - قوتابی- دەستی پێ بکا لەبەرکردنی قورئانی بەدەسەڵاتە کە گرینگترینی هەموو زانستەکانە، وە جاران پێشین (سلف) فەرموودە و فیقهیان فێری کەسێك نەدەکرد مەگەر ئەو کەسە قورئانی لەبەر بوایە... وە دوای لەبەرکردنی قورئان لە هەموو زانستێك کورتەیەك لەبەر دەکا، لەمەشەوە لە گرینگترینیان دەست پێدەکات، وە لە هەمووشیان گرینگتر (فیقە و نەحو)وە، پاشان فەرموودە و ئوصول، پاشان ئەوانی تر پێ بەپێ و ئەوەندەی توانرا...).

---

(1) المجموع للنووي (1/ 38).

**وسئل ابن تيمية رحمه الله: أيما طلب القرآن أو العلم أفضل؟**

**فأجاب رحمه الله: (أما العلم الذي يجب على الانسان عيناً كعلم ما أمر الله به، وما نهى الله عنه، فهو مقدم على حفظ ما لا يجب من القرآن، فإن طلب العلم الاول واجب، وطلب الثاني مستحب، والواجب مقدم على المستحب. وأما طلب حفظ القرآن فهو مقدم على كثير مما تسميه الناس علماً وهو إما باطل، أو قليل النفع وهو أيضاً مقدم في التعلم في حق من يريد أن يتعلم علم الدين من الاصول والفروع، فإن المشروع في حق مثل هذا في هذه الاوقات أن يبدأ بحفظ القرآن، فإنه أصل علوم الدين...)**(1).

**واتە: لە ئیبنو تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێ پرسیارکرا: ئایا فێربوون و لەبەرکردنی قورئان لەپێشترە و فەزڵی زیاترە یان زانستەکانیتر؟**

**ئەویش لەوەڵامدا گوتی: ئەو زانستەی لەسەر مرۆڤەکان پێویستە و فەرزی عەینە وەکو زانیاری هەبوون بەو کارانەی خوا فەرمانی پێ کردووە، وە بەو کارانەی خوا لێی قەدەغەی کردووە، ئەوە بێگومان -ئەوەی باس کرا- لە لەبەرکردنی ئەو ئایەت و سوڕەتانەی واجب و پێویست نین لەپێشترە، چونکە بەڕاستی داواکردنی ئەوەی یەکەم واجبە، وەهی دووەم سوننەتە، وەئاشکرایە کە واجب لەپێشترە لە سوننەت. بەڵام لەبەرکردنی قورئان لەپێشترە لە زۆربەی ئەوەی خەڵکی ناویان ناوە زانست، کە لەڕاستیدا یان پووچن یان سوود و کەڵکیان کەمە، وە هەروەها لەبەرکردنی قورئان لەپێشترە بۆ کەسێك کە دەیەوێ فێری زانستی ئایینی بێ لە ئوصول و لقەکان (الفروع)، چونکە بەڕاستی ئەوەی پێویستە بۆ ئەو**



---

(1) مجموع الفتاوى لإبن التيمية (23/ 54- 55).

کەسە لەم کاتانەدا دەستی پێ بکا بریتییە: لە لەبەرکردنی قورئان کە بێگومان قورئان بنچینە و سەرچاوەی زانستەکانی ئایینە...).

ئیبن جەوزی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ:( ولیس من حفظ نصف القرآن كمن حفظ الكل، ولا من حفظ مائة حديث كمن حفظ ألفاً، وعلى هذا فليس العلم إلا ماحصل بالحفظ.

قال عبدالرزاق بن همام: كل علم لا يدخل مع صاحبه الحمام فلا تعده، وانشد:

وليس بعلم ماحوى القمطر        وما العلم إلا ما حواه الصدر)[1].

واتە: (ئەوەی نیوەی قورئانی لەبەرە هەرگیز وەکو ئەو کەسە نییە کە هەموو قورئانی لەبەرە، وە ئەوەی سەد (100) فەرموودەی لەبەرە وەکو کەسێك نییە کە هەزار (1000)ی لەبەرە، بۆیە لەسەر ئەم بنچینەیە زانست هەر ئەوەیە کە بە لەبەرکردن هاتۆتە دی.

عەبدولڕەزاقی کوڕی هەممام دەڵێ: هەر زانستێك لەگەڵ خاوەنەکەی نەچێتە گەرماو ئەوا بە زانستی دامەنێن. وەدەیگوت:

ئەوە زانست نییە کە لە کتێبخانەدایە

وەزانست نییە مەگەر ئەوەی لە سینگدایە)[2].

ماوەردی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ:( والعرب تقول في أمثالها: حرف في قلبك خير من الف في كتبك).

واتە: ( پیتێك لە دڵەکەت بێ چاکترە لە هەزار پیت لە ناو کتێبەکانت ).



(1) الحث على حفظ العلم لإبن الجوزي (ص/ 13) ، والبيت المذكور للخليل بن أحمد رحمه الله، ذكره ابن عبدالبر في جامع بيان العلم (1/ 68).

(2)أدب الدنيا والدين للماوردي (ص65).

## خاڵی سێیەم:

## فەزڵ و گەورەیی لەبەرکردنی قورئانی مەزن و هەڵگرانی

بەڕاستی هەڵگرانی قورئان پلە و پایەیەکی ئێجگار مەزنیان هەیە کە لە سەرووی هەموو پلە و پایەیەکە، ئەمەش لەبەر پەیوەندییەکەی بە فەرموودە و کەلامی خوای گەورە، وە خوای گەورە ئەم قورئانەی لە دڵەکان پێش نووسینەوەی لە پەڕاوەکان پاراست، وە کەسانێکی شایستەی بۆ ئامادەکرد کە سینە و دڵ و ژیرییان لەقورئان پڕبکەن، وە بەسە بۆ هەڵگرانی قورئان کە خوای گەورە لە فەرموودەی خۆی ناوی هێنابن و سیفەتی زانای دابنە پاڵ، وە ئەگەر بۆ هەڵگرانی قورئان هیچ باس و خواسێك نەبوایە جگە لەوەی خوا لەم ئایەتە ناوی هێناون و باسی کردوون ئەوا بەسیان بوو، وەکو دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾[1].

وەبۆ زانین و زیاتر دەرخستنی پلە و پایەی قورئان لەبەرەکان چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و بەسەر هاتێك باس دەکەین:

لە ئەبو دەردائەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: ((من حفظ عشر آيات من أول سورة الكهف عصم من الدجال))[2].

واتە: ((هەر کەسێك دە (10) ئایەت لە سەرەتای سوڕەتی کەهف لەبەر بکات ئەوا پارێزراوە لە ئاژاوەی دەجال)).



---

(1) سورة العنكبوت (49).

(2) رواه مسلم (1342)، و احمد (20720).

باشە ئەگەر بە لەبەرکردنی دە (10) ئایەت لە سەرەتای سورەتی کەهف خوای گەورە ئەو کەسە بپارێزێ لە ئاشوبێکی هەرە گەورە کە دەججالە. ئەی دەبێ بە لەبەرکردنی هەموو قورئان خوای گەورە چ ڕێزو پاداشتێکی مەزنی لەلای خۆی بۆ ئەو کەسە هەڵگرتبێ؟! بەڕاستی مەزنی و گەورەیی ئەو پاداشتە هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ چەندە.

لە عائیشەی دایکمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((من أخذ السبع الاول من القرآن فهو حبر)) [1].

وفي المستدرك: (فهو خير))[2].

واتە: ((هەرکەسێك حەوت (7) سورەتە گەورەکەی یەکەم لە قورئان لەبەر بکا و لێیان شارەزا بێ ئەوا زانایەو لە زانستدا بەقووڵ داچووە)).

وە لە موستەددرەکدا: ((ئەوە لە چاکەکارانە)).

سورەتەکانیش ئەمانەن:( البقرة، آل عمران، النساء، المائدة، الأنعام، الأعراف، التوبة ).

تێبینی: زانایان لەسەر دیاری کردنی سورەتی حەوتەم جیاوازییان هەیە، هێندێك دەڵێن سورەتی ( التوبة والأنفال )ە ، هێندێکیتر دەڵێن (یونس )ە ، وەئەوەی ئێمە دیاریمان کردووە لەسەر ڕای پێشەوا ( الباني)یە کە دەڵێ سورەتی( التوبة )یە[3].

---

(1) رواه أحمد (23390)، وشعب الايمان للبيهقي (2317)، وسلسلة الأحاديث الصحيحة للألباني (2305).

(2) المستدرك على الصحيحين للحاكم (2025).

(3) بڕوانە: فضائل القرآن وأحكامه من صحيح الإمام الألباني) لإبراهيم المناوي (ص 69–70 ).

له جابری کوڕی عەبدوڵڵاوه ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕێتەوه: (أن النبي صلى الله عليه وسلم كان يجمع بين الرجلين من قتلى أحد- يعني في القبر- ثم يقول: (أيهما اكثر اخذاً للقرآن؟)، فإذا اشير الى احدهما قدّمه في اللحد)[1].

واتە:( پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کوژراوەکانی غەزای ئوحودی دووپیاو دووپیاو لەیەك قەبردا دەناشت، پاشان دەیفەرموو: ((ئەم دوو کوژراوه کامیان قوڕئانی زیاتر لەبەره؟))، جا کە ئاماژەیان بۆ یەکێکیان دەکرد، پێغەمبەر ئەوی بۆ گۆڕیچکەکە پێش دەخست تاکو زووتر بینێژن ).

هیشامی کوڕی عامر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێ: ( لما كان أحد، اصيب من أصيب من المسلمين، وأصاب الناس جراحات [ فقلنا يا رسول الله الحفر علينا لكل إنسان شديد ]، [ فكيف تأمرنا]، قال: احفروا وأوسعوا [وأعمقوا] واحسنوا] وادفنوا الاثنين والثلاثة في قبر، قدّموا اكثرهم قرآناً، [فكان أبي ثالث ثلاثة، وكان اكثرهم قرآناً، فقدم][2].

واتە: ( لە ڕۆژی ئوحوددا ئەوەی کوژرابوو لە مسوڵمانان کوژرابوو، هەندێك خەڵکیش بریندار بوون، جا گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا هەر پیاوێك و گۆڕێکی بۆ هەڵکەنین نارەحەتە لەسەرمان، فەرمانمان چۆن پێ دەکەیت؟).

فەرمووی: (( گۆڕی فراوان هەڵکەنن و قووڵ و چاکی بکەن، وەدوو دوو و سێ سێ بیانخەنە گۆڕێکەوه، وەکامیان قوڕئانی زیاتر



(1) رواه البخاري (1343)، و أبو داود (3135)، وأحمد (3/ 183)، والنسائي (1/ 277)، والترمذي (1036)، وابن ماجه (1514).

(2) رواه النسائي (4/ 80- 81)، وأبو داود (3215).

لەبەرە پێشی بخەن )).

وەهیشام دەڵێت: (باوکی من سێیەمی سێ کەسەکە بوو، وە لە دوو کەسەکە قورئانی زیاتر لەبەر بوو، لەبەرئەوە پێش ئەوان خرا).

بەڵێ؛ ئەمەیە فەزڵ و گەورەیی کەسێك دەستی بە قورئان گرتبێ و لە سینگیدا کۆی کردبێتەوە و کاری پێکردبێ، دیارە گەورەترین کاریش لە پێناو خودا دا بەرز کردنەوەی ووشەی خوایە (قورئان) بە خوێن و ماڵ، هەر بۆیە قورئان لە دوای مردنی ئەو کەسەشدا وازی لێناهێنێ و لەگەڵیدا دەبێ و پێش خەڵکی تری دەخا.

بەڕاستی ئەمەیە شەڕەف و پلەوپایە، جا بانگەوازێك دەکەین و دەڵێین:

هۆ خەڵکینە کێ هەیە لە ئێوە ئەم شەڕەفە لە دەست خۆی نەدا تاوەکو خوا و پێغەمبەرەکەی بەچاوی ڕێزەوە سەیری بکەن و مامەڵەی تایبەتی لەگەڵ بکەن، با بێتە مەیدان بۆ لەبەرکردن و کارپێکردنی قورئان.

لە عائیشەی دایکمانەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((الماهر بالقرآن مع السفرة الكرام البررة، والذي يقرأ القرآن ويتتعتع فيه وهو عليه شاق له أجران)) [1].

واتە: ((ئەو قورئان خوێنەی کە بەڕەوانی و بێهەڵە قورئانی لەبەرەو دەیخوێنێ‌و- ڕەفتاری پێ دەکا- ئەوە لە پایەی ئەو فریشتە بەڕێزو چاکەکارانەدایە کە لە جیهانی باڵادان، وە ئەوکەسەی کە دەیخوێنێ و بە گران بۆی لەبەر دەکرێ ئەوا دوو پاداشتی [2] بۆ هەیە)).

---

(1) رواه البخاري (4937)، ومسلم (798).

(2) پاداشتێك بۆ خوێندنەوەکەی وەپاداشتێك بۆ زەحمەتیەکەی، بەڵام کۆمەڵ و دەستەی یەکەم لە هی دووەم بەرز و پاداشت زیاترن. بڕوانە: شرح رياض الصالحين للعثيمين (102/3).

عن عامر بن وائلة: أن نافع بن عبدالحارث لقي عمر بعسفان، وكان عمر يستعمله على مكة، فقال: من استعملت على أهل الوادي؟ فقال: إبن أبزى.

قال: ومن إبن أبزى؟ قال: مولى من موالينا

قال: فاستخلفت عليهم مولى؟

قال: انه قارئ لكتاب الله عزوجل وانه عالم بالفرائض.

قال عمر ﷺ: أما إن نبيكم -صلى الله عليه وسلم- قد قال: ((إن الله يرفع بهذا الكتاب أقواماً ويضع به آخرين)) [1].

واتە: لە عامری کوڕی وائلەوە دەڵێ: کە نافعی کوڕی عەبدولحارث لە ناوچەی عەسفان بە عومەری کوڕی خەتتاب گەیشت، کە عومەر ڕەزای خوای لێ بێ کردبووی بە کاربەدەست بە سەر مەککەدا.

عومەر گوتی: کێت کردووە بە کاربەدەست- لە دوای خۆت- بەسەر خەڵکی ئەم دۆڵە؟

نافع گوتی: ئیبنو ئەبزا.

گوتی: ئیبنو ئەبزا کێیە؟

نافع گوتی: یەکێکە لە پێشخزمەت و کارگوزارەکانمان.

عومەر گوتی: جا کارگوزارت کردووە بە جێنشینی خۆت لەسەریان؟

نافع گوتی: ئەو کەسێکی قورئان لەبەرەو شارەزایە بە زانستی میرات بەش کردن.

عومەر گوتی: ڕاستە کە پێغەمبەرەکەتان صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:( لە ڕاستیدا خوا بەهۆی ئەم قورئانە چەند گەل و هۆزو کەسانێك سەربەرز دەکات و چەندانی تریش نزم و نەوی دەکات )).

---

(1) رواه مسلم (817)، وابن ماجه (218)، وابن عباس (772)، والدارمي (3318).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕەوە ڕەزای خوایان لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: ((يقال لصاحب القرآن إقرأ وارق ورتل كما كنت ترتل في الدنيا فإن منزلتك عند آخر آية تقرؤها))[1].

واتە: ((لە بەهەشتدا بەقورئان خوێن دەڵێن: قورئانت چەند لەبەرە بەئارامی و مۆڵەت و لەسەرەخۆو جوان بیخوێنە، وە بە پایەکانی بەهەشتدا سەربکەوە، وەك چۆن لە دونیادا قورئانت هێدی هێدی و لەسەرەخۆو جوان دەتخوێندەوە، چونکە پایەی تۆ لەو شوێنەدایە کە دوا ئایەت دەخوێنی و لە دونیادا لە بەرت کردووە)).

وەهەروەها پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((إن عدد درج الجنة على عدد آي القرآن، فيقال للقارئ يوم القيامة: إقرأ وارتق، فإن كان معه نصف القرآن يقال له: لو كان عندك زيادة لزدناك))[2].

واتە:(( بەڕاستی ژمارەی پایەکانی بەهەشت بە ئەندازەی ژمارەی ئایەتەکانی قورئانە، بۆیە لە ڕۆژی دوایدا بە قورئان لەبەر دەگوترێ: بخوێنە و بە پایەکانی بەهەشت سەربکەوە، جا ئەگەر نیوەی قورئانی لەبەرکردبێ پێی دەگوترێ: ئەگەر زیاترت لە لا بوایە زیاترمان لە پایەکانی بەهەشت پێدەبەخشی)).

جا دەبێ لەو ڕۆژەدا چەند کەسمان لەبەرئەوەی گرنگیمان بە لەبەرکردنی قورئانی مەزن نەداوە سەرنەکەوین بە پایەکانی بەهەشت، یان هێندێکمان لێ لەبەرکردووەو بەقەد ئەمە سەردەکەوین و لە شوێنێك

(1) رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح (2912)، وصحيح الترمذي للألباني (2329)، وأبوداود (1664)، وأحمد في المسند (2/ 193)، وابن حبان (موارد 1789)، وصححه الحاكم (1/ 552-553) ووافقه الذهبي، وصحيح الجامع للألباني (8122).

(2) حسنه الألباني في المشكاة (2134).

دەوەستین کە ئەو کات خۆزگەی ئەوە دەخوازین: زیاترمان لە قوڕئان لەبەربکردبووایە و لە دونیادا زیاتر خۆمان بۆ ماندوو بکردبووایە، وە کاتی زیاترمان بۆ تەرخان بکردبووایە تا ئێستا زیاتر سەربکەوتینایە و نزیکتر ببووینایە لە بارەگای خوای خاوەن شکۆ.

دەبا ئەو ڕۆژە کە گومانی تێدانیە بهێنینە بەرچاو و خۆمان لەو حاڵەتە دابنێین ئاخۆ ئێمە لەکام کۆمەڵ دەبین، ئەوانەی بە هەموو پایەکانی بەهەشت سەردەکەون یان ئەوانەی لە شوێنی خۆیان دەچەقن؟

وە دووبارە دەڵێین: با ئێستا لە دونیادا مەردوو ئازا بین و هەوڵبدەین بۆ لەبەرکردنی هەموو قوڕئان تا لە ڕۆژی دواییدا پێمان نەگوترێ: ((لو كان عندك زيادة لزدناك)): ئەگەر زیاترت لە قوڕئان لە لا بوایە زیاترمان لە پایەکانی بەهەشت پێدەبەخشی و سەردەکەوتی.

برای شاعیریش: کاك فەرهاد جەوهەر برادۆستی دەڵێ:

قوڕئان لەبەرکە مەڵێ زەحمەتە
خۆت بێبەش مەکە ئا لەو ڕەحمەتە
خودا لە بەهەشت پێت دەڵێ وەرە
قوڕئانی منت چەندە لەبەرە
بخوێنە و بڕۆ بەبێ دڵ پەستی
لە کوێ کۆتاهات لەوێ دەوەستی
نێوان سەرەتا و کۆتایی چەندە
پێشکەشت دەکا خودای بەخشندە

1

له ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لیٚ بێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:(( یجيء صاحب القرآن يوم القيامة، فيقول القرآن: يا رب حله فيلبس تاج الكرامة ثم يقول: يا رب زده فيلبس حلة الكرامة، ثم يقول: يارب إرض عنه فيرضى عنه، فيقال له: أقرأ وارق ويزداد بكل آية حسنة ))[1].

واتە: (( لە ڕۆژی دوایدا هاوەڵ و هاوڕێی قورئان دەهێنرێ، جا (پاداشتی) قورئان دەڵێ: ئەی پەروەردگار بۆی حەڵاڵ بکە و شایەنی بکە.. جا تاج و گوڵینەی کەرامەتی پێدەبەخشرێ و لەبەردەکرێ، پاشان قورئان دەڵێ: ئەی پەروەردگار بۆی زیادبکە.. جا گەوهەرو خشڵی شەرەف و کەرامەتی لەبەردەکرێ، پاشان قورئان دەڵێ: ئەی پەروەردگار لێی ڕازی ببە.. خوای گەورەش لێی ڕازی دەبێ، جا پێی دەگوترێ: بخوێنە و سەربکەوە، وەبۆ هەر ئایەتێکیش چاکەیەکی بۆ زیاد دەکرێ)).

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((إن لله أهلين من الناس))

قيل: من هم يا رسول الله؟

قال: ((أهل القرآن أهل الله وخاصَّتُهُ))[2].

واتە: (( بەڕاستی خوای گەورە کەسانێکی لە خەڵکی هەن ))

گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە کێن؟

فەرمووی: (( ئەهلی قورئان ئەهلی تایبەتی خوای گەورەن )).



---

(1) رواه الترمذي وقال هذا حديث حسن صحيح (2839)، والمستدرك على الصحيحين للحاكم، والبيهقي في شعب الايمان (1940).

(2) أخرجه أحمد (127/3)، وابن ماجه (215)، والنسائي في فضائل القرآن (56)، وصححه المنذري في الترغيب والترهيب (303/2)، وصحيح الجامع للألباني (2165).

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (( لو كان القرآن في إهاب ما مسته النار ))[1] .

واتە: (( ئەگەر قوڕئان لە دڵی هەر کەسێکدا بێ ئاگر بەری ناکەوێ )).

وقال ابن هانيء لأحمد بن حنبل رحمهم الله: (ما معنى: ((لو كان القرآن في إهاب ما مسته النار)) قال هذا يرجى لمن القرآن في قلبه أن لا تمسه النار[2].

واتە:ئیبن هانی بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی گوت:مانای ئەم فەرموودەیە چىیە کە دەڵێ: ((لو كان القرآن في إهاب ما مسته النار)).

گوتی:هیوا وایە بۆ ئەو کەسەی هەموو قوڕئانی لە دڵدایە ئاگر بەری نەکەوێ.

تێبینی: ئەم فەرموودەیە لەلایەن هێندێك لە زانایانی تر شەرح و لێکدانەوەی تریشی بۆ کراوە.

جا هەرکەسێك دەیەوێ دڵنیابێ بە ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ نەسوتێ با لەناو دڵیدا جێگەی قوڕئان بکاتەوەو لە ڕەفتاریدا ڕەنگی پێبداتەوە.

بەڵێ" با هەوڵدەین لەم ڕزگاربوون و سەرکەوتنە گەورەیە خۆمان بێبەش نەکەین و ئەو هەموو ماندووبوونەی بۆ دونیا سەرفی دەکەین هێندێکیشی بۆ قیامەتی خۆمان بێ.



(1) أخرجه أحمد (151/4)، والدارمي (3310)، والبغوي في شرح السنة (1180)، وله شاهد يتقوى به عند الطبراني من حديث عصبة بن مالك. بڕوانە: الاداب الشرعية والمنح المرعية (34/2).

(2) بڕوانە: الاداب الشرعية والمنح المرعية لأبن مفلح المقدسي (2/ 34).

له ئەبو سەعیدی خودرییەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەڵیٚ: پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (( إذا كانوا ثلاثة فليؤمهم احدهم، واحقهم بالامامة اقرؤهم))[1].

واته: (( ئەگەر سیٚ کەس بوون با یەکیٚکیان بەرنویٚژی و ئیمامەتییان بۆ بکا، وە لەهەموویان شایەنتر ئەوەیە کە قورئانی زیاتر لەبەرە )).

له ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەڵیٚ: ( بعث رسول الله صلى الله عليه وسلم بعثاً وهم ذو عدد، فاستقرأهم فقرأ كل رجل منهم ما معه من القرآن فأتى على رجل من أحدثهم سناً، فقال: ((مامعك يا فلان))؟ فقال: معي كذا وكذا وسورة البقرة. قال: (أمعك سورة البقرة))؟ قال: نعم. قال: ((اذهب فأنت اميرهم)).

فقال رجل من اشرفهم والله يا رسول الله مامنعني أن أتعلم سورة البقرة إلا خشية أن لا أقوم بها.

فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ((تعلموا القرآن فاقرأوا وأقرئوا، فإن مثل القرآن لمن تعلمه فقرأه وقام به كمثل جراب محشو مسكاً يفوح بريحه كل مكان ومثل من تعلمه فيرقد وهو في جوفه كمثل جراب وكئ على مسك))[2]).

---

(1) رواه مسلم (672).

(2) رواه الترمذي (2876) في ثواب القرآن، باب ماجاء في فضل سورة البقرة وآية الكرسي وقال: هذا حديث حسن، وأخرجه ابن ماجه (217) في المقدمة (مختصراً دون ذكر القصة)، والنسائي في الكبرى (تحفة الاشراف 10/ 280) (8749) وفيه عطاء مولى أبي أحمد ولما يعرف، وللحديث شاهد ضعيف جداً من حديث عثمان ﷺ: رواه الطبراني في الاوسط (المجمع 7/ 164)، والدار قطني في الافراد (كنز العمال 4020) وفيه يحيى بن مسلمه بن كهل وهو شيعي متروك. وحسنه شعيب الارنؤوط في الاداب الشرعية والمنح المرعية لإبن قدامة المقدسي (409/2).

واتـە: جارێـك لـە جـاران پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـە وسـلم لەشـكرێكی گـەورەی نـارد بـۆ شـوێنێك، يەكـە يەكـە داوای لێكـردن كـە چەنديان لە قورئان لەبەرە بيخوێنن، جا هەر پياوێك چەندەی قورئان لەبەر بوو دەيخوێند، تا نۆرە هاتە سەر پياوێك كە لە گشتيان گەنجتر بوو، پـێی فەرموو: (( ئەی فلان! تۆ چيت لەبەرە ))؟

گوتی: ئەوە و ئەوە و سورەتی (البقرة)شم لەبەرە.

فەرمووی: (( سورەتی(البقرة)شت لەبەرە ))؟!

گوتی: بەڵێ لەبەرمە.

پێغەمبـەر صـلى الله عليـە وسـلم فـەرمووی: (( دەبـڕۆ تـۆ ئـەمير و فەرماندەيانيت )).

پياوێـك لـە خانەدانـەكانيان گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! مـن بۆيـە سورەتی( البقرة ) فێر نـەبووم و لەبـەرم نـەكرد ترسـام نـەبادا بەباشـی بۆی هەڵنەستم.

ئينجا پێغەمبـەر صـلى الله عليـە وسـلم فـەرمووی:(( قورئـان فێـربن و لەبـەری بكـەن، هـەم خۆتـان بيخـوێنن و هـەم بەخـەڵكی تريـشی بخـوێنن، چونكە ئەوكەسەی فێری قورئـان دەبـێ‌و دەيخوێنـێ و ئـەركی بـەجێ دێنـێ وەك هەمبانەی پڕ لە ميسك وايە، بۆنە خۆشەكەی بە هەموو لايەكدا دەڕوا، بەڵام ئەوكەسەی كە فێری دەبێ و لەبـەری دەكات و دەخـەوێ و قورئانەكە لە سينگيدايە ئەوە وەك هەمبانەی پڕ لە ميسكی دەم دووراوە وايە )).

## خاڵی چوارەم: قورئان و منداڵ

هەرچەندە لە بەرگی یەکەم ئەم بابەتەمان باس کرد بەڵام بە پشتیوانی خوای بەهێز لێرەدا لەبەر گرنگی‌یەکەی و فەرامۆش کردنی منداڵەکانمان لەلایەن زۆربەمان تیشکی زیاتری دەخەینە سەر:

**1- کەی دەست دەکرێت بە فێرکردن و لەبەرکردنی قورئانی مەزن بۆ منداڵان؟**

لەوانەیە لات سەیر بێ ئەگەر بڵێین هەر لەوکاتەی کۆرپەلە لەناو سکی دایکی‌یەتی بە تایبەتی لە شەش (6) مانگی دەتوانی ئامادەی بکەی بۆ لەبەرکردنی قورئان، وەهەرکەسێکیش دەیەوێ منداڵەکەی قورئانی مەزن لەبەر بکات با لە نزیک منداڵەکەی لەو کاتەی لەناو سکی دایکی‌یەتی زۆر قورئان بخوێنێتەوە تاوەکو ئەو زانیاری‌یانە لە ژێری ناوەوە یاخود هۆشی خۆنەویست تۆمار بکا و کۆی بکاتەوە، چونکە زانستی نوێ ئەوەی دۆزیوەتەوە کە کۆرپەلە لە سەرەتای مانگی شەشەمی ناو سکی دایکی هەستی بیستنی- بەشێوەیەکی سنوردار- بە ئیش دەکەوێ و ئەو دەنگانەی لە دەرەوە دێن دەیبیستێ.

مامۆستا (عبدالکریم جراد) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (کیف تصبح حافظاً للقرآن) باس لە دوو ڕووداو دەکات کە بەسەر خۆیدا هاتووە و دەڵێ: ( زۆرجار لە ماڵەکەماندا بە ئاوازو دەنگێکی بەرز بانگم دەدا کە لەو کاتەدا خێزانەکەم سکی هەبوو بە (نوڕ)ی کچم، دوای ئەوەی خوا هێنایە دونیا هەر بەردەوام بووم وە زۆر جاریش لەنزیک ئەو منداڵەماندا بانگم دەدا کە لەوکاتەدا لەتەمەنی دوو تا سێ مانگیدا بوو.

دەڵێ: جا سەیر لەوە دابوو کاتێک زۆر دەگریا و نەماندەتوانی کپی بکەینەوە یەکسەر بانگم بە گوێدا دەدا هەر ئەوەندە کە دەم گوت:(الله أكبر،

الله أكبر) منداڵەکەمان بێدەنگ دەبوو و چاوەکانی دەکردەوە، وەکو بڵێی شتێکی خۆشی بیستبێ.

وەهەروەها سەرسامییەکی تر لەم منداڵەماندا ئەوە بوو جارێکیان سەردانی خزمێکمان کرد، ئەو منداڵەمان کە لە تەمەنی ساڵ و نیوێکدا بوو، دەستی دایە کۆنترۆڵ و دوگمەی گۆڕینی کەناڵەکانی دادەگرت- کە لە ڕاستیدا نازانێ چی دەکا- تا گەیشتە کەناڵی قورئانی مەزن ئیدی وازی لە کۆنترۆڵەکە هێناو قنج گوێی بۆ قورئانەکە شل کرد هەروەکو ڕەفتارکردنی کەسێکی گەورە هەرچەندە دەرکی بەوە نەدەکرد کە چی دەکا، بەڵام ئەو فەرموودە بەرزو مەزنەی هاتۆتەوە بیری کە کاتی خۆی لەچەند مانگی دوایی کۆرپەلەیی ناوسکی دایکیدا گوێ بیستی بوو بوو).

بۆیە زانایان ئامۆژگاری ئەوەمان دەکەن کە لە ماڵەوەدا تەسجیلێك بە بەردەوامی بۆ خوێندنەوەی قورئانی پاكو بێخەوش هەبێ هەرچەندە لە ڕواڵەتدا منداڵەکان سوودی ڕاستەوخۆی لێ وەرناگرن بەڵام لە بیرو هۆشی خۆنەویستیاندا هەڵی دەگرن و ڕۆژێك لە ڕۆژان بە کەڵکیان دێ و دێتەوە یادیان. وە هەروەها دایك و باوکان خۆشیان زۆر قورئان بخوێننەوە، چونکە منداڵەکان چاو لەوان دەکەن، کوردیش گوتویەتی: (گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە).

ئەمە کە منداڵ ساوا و کۆرپەلەیە، وە کاتێك منداڵەکان هەراش دەبن و جودایی لە نێوان کاری چاك و خراپ و ساردی و گەرمی دەکەن دەبێ هەوڵی زیاتریان لەگەڵ بدرێ بۆ لەبەرکردنی قورئانی شکۆدار چونکە منداڵان وەکو پەڕەی سپی وان چیان لەسەر تۆمار بکرێ هەرئەوە دەخوێننەوە، کەواتە دەبێ پشت گوێ نەخرێن و گرنگییەکی تایبەتیان

پێبدرێ، وە بە ئەندازەی فێرکردن و گرنگی پێدانیان، لەدواڕۆژدا چوست و چالاك و توندو تۆڵ و زیرەکتریان لێ دەردەچێ. بۆیە لەمەشدا پێشینە چاکەکانمان منداڵەکانیان هەر بە بچووکی ناوەتە بەر خوێندن و لەبەرکردنی قورئان و هەوڵیان داوە مامۆستای باش و چاکیان بۆ دابین بکەن تا کەسێکی جوامێر و بەتوانا و دانایان لێ دەربچێ. تەنانەت هەموو ئەو زانایانەی کە لەلای ئێمە بەناوبانگن و ماف و فەزڵیان هەیە بەسەرماندا ئەگەر سیرەو مێژووی ژیانیان بخوێنینەوە دەبینین هەر لە بچووکی دەستیان داوەتە فێربوونی زانست و زانیاری، وە لە پێش هەمووشیان لەبەرکردنی قورئانی پایەدار هەروەك لە دوایدا چەند نموونەیەکیان لێ دەهێنینەوە.

## 2- هۆکارە پاڵنەر و هاندەرەکانی لەبەرکردنی قورئانی مەزن بۆ منداڵان:

أ- دەربڕین بە قسە: بۆ نمونە دایك و باوکان کاتێك منداڵەکانیان هەراش دەبن پێیان بڵێن: ئەم منداڵەمان زۆر زیرەکە و دڵنیاین قورئان لەبەر دەکا. یان پێیان بڵێن: تۆ دواڕۆژت دەبێ و کەسێکی زاناو داناو قورئان لەبەرت لێ دەردەچێ... هتد، کە ئەم جۆرە هاندانە وادەکات دەماخ هۆڕمۆنێك دەربدا کە دەبێتە هۆی بارگاوی کردنی مرۆڤ بە ووزەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر و پەیداکردنی متمانە بەخۆبوون. بەڵام ئەگەر دەربڕینەکان شکێنەرو ڕووخێنەر بوون ئەوا کارەکە پێچەوانە دەبێتەوە. وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هاوەڵەکانی بە چاکترین نازناو ناو دەناو هانی دەدان وەکو: ( الصّديق- الفاروق- الكرّار- ذو النورين- امين هذه الامة- سيف الله المسلول- اسد الله....).

ب- نزاو پاڕانەوە: پاڕانەوەی دایك و باوكان و لالانەوەیان لە خوای گەورە بۆ منداڵەكانیان یەكێكە لە هۆكارە هەرە گرنگەكان كە وادەكات منداڵەكانیان دواڕۆژیان پڕشنگدار بێ، نەوەكو هێندێك لە دایك و باوكان لەجیاتی دوعای خێر توك و دوعای شەڕ لە منداڵەكانیان دەكەن تەنها لەبەرئەوەی هەرەپاس و بەجووڵەن كە ئەمەش هەڵەیەكی گەورەو ستەمێكی ئاشكرایە، چونكە هێشتا بچووكن و هیچ تەكلیفێكی شەرعییان لەسەر نییەو زۆربەیان ناتوانن تەمیز لەمابەینی كاری چاك و خراپ بكەن.

ج- پێشەنگی چاك: پێشەنگی چاك لە دایك و باوكان ئەگەر چاك بن ئەوا بەهێزترین و بەسوودترین هاندەرن بۆ منداڵەكانیان بۆ كاری چاك، چونكە منداڵ لە سەرەتای تەمەنیدا بەتایبەتی ساڵی یەكەم و دووەمی تەمەنی ناتوانێ بەزمان قسە و گفتوگۆ بكا، بەڵكو هەرچی ببینێ لاسایی دەكاتەوە[1]، جا كە ببینێ لەماڵەوە زۆر قورئان دەخوێنرێ و لەبەر دەكرێ ئەویش لاسایی دەكاتەوەو هەر هیچ نەبێ كتێبێك دێنێ و لەسەری دەخوێنێ و لەوانەیە بە ئاوازیشەوە ئەو ووشانەی بە ئاستەم فێری بووە و زمانی لەگەڵی تەتەڵە دەكا دووبارەیان بكاتەوە هەندێك جاریش لەبەریان بكا.

---

(1) كچۆڵەیەكی دوو ساڵەمان هەیە بەناوی (بەهرە) خان، منیش لەوكاتەی لەسەرو بەندی ڕێكخستنی ئەم بابەتە (پێشەنگی) دا بووم بەنیازی نان خواردنی بەیانی مێزو كورسییەكەم جێ هێشت، بەهرە خانیش دوای من پوختە هاتبووە سەر كورسییەكەم و بە قەڵەم جاف چاك چاك دەفتەرەكەمی نووسیبوو و خەتی پێدا هێنابوو بە حسابی خۆی- وەكو من- نووسینەوە دەكا. ئیدی بە چاكم زانی ئەم ڕووداوە وەكو بەڵگەیەك لەسەر لاسایی كردنەوەی منداڵەكان بۆ دایك و باوكیان لە ئیش و كارەكانیان بنووسم.

**کەواتە ئەگەر ماڵێك قورئانی تێدا نەخوێندرێ ئەوا هەرگیز چاوەڕێ مەکە هەڵگری قورئانی تێدا هەڵکەوێ.**

**( وەکاتێك لە باوکی ئەو دوو منداڵە (موحەممەد) و (مظهر) پرسیارکرا کە نهێنی لەبەرکردنی قورئانی مەزنی هەردوو کوڕەکەی چی‌یە؟**

**لەوەڵامدا گوتی: بەڕاستی خوێندنەوەی قورئانی مەزن شەو و ڕۆژ بۆ ماوەی بیست و چوار (24) کاتژمێر بەبەردەوامی لە ماڵەوەماندا دەنگی دەدایەوەو کۆمپیوتەرەکەمان نەدەکوژایەوە نە لەکاتی نووستن وە نە لەکاتی بەئاگایی، وە نە لەکاتی خواردن و خواردنەوە، ئەمە پێش ئەوەی هەردوو کوڕەکەم قوڕئان لەبەر بکەن، وەهەروەها دوای لەبەرکردنیشیان هەر بەم شێوەیە مایەوە.**

**وەهەروەها لە باوکی منداڵە ئێرانی‌یەکە کە ناوی (موحەممەدی کوڕی حوسەینی تەباتەبائی)یە پرسیارکرا لە نهێنی لەبەرکردنی قوڕئانی مەزنی کوڕەکەی؟**

**لەوەڵامدا گوتی: من و دایکی موحەممەد قوڕئانمان لەبەردەکرد و لە حەلەقەکانی لەبەرکردنی قوڕئان بەشداریمان دەکرد، جا زۆر خوێندنەوەو پێداچوونەوەی قوڕئانی ڕێ پۆشنکەرەوە کاریگەری‌یەکی گەورەی هەبوو لەسەر دروستکردن و بەرنامەکاری دەماخی ئەم منداڵە بچووکە هەتا لەوکاتەی کۆرپەلەش بوو لەسکی دایکی) [1]**



---

(1) کیف تصبح حافظاً للقرآن لعبدالکریم جراد (ص 37).

د- نموونە هێنانەوەو پێك چواندن: ئەگەر دایك و باوك بە منداڵەکەیان بڵێن: تۆ بەفلانە کەس دەچی و ئەوەندەو ئەوەندە زیرەك و زانای، یان تۆ وەکو فلانە کەس زیرەك دەبی لە لەبەرکردنی قورئان...هتد، جا دەبینین ئەو منداڵە بە بێدەستی خۆی هەڵدەستێ بە لاسایی کردنەوەی ئەو کەسە، تەنانەت هێندێك جار لە قسەو ڕۆیشتن و شێوەی گفتوگۆ کردنیشی.

هـ- چیرۆك و ڕووداو: گێڕانەوەی چیرۆك و ڕووداو بۆ منداڵان بەتایبەتی بەر لە نووستن کاریگەری هەیە لە وەرگرتن و فراوان کردنی بیرو هۆش، چونکە لەکاتی نووستندا کۆتا زانیاری کە بەر لە نووستن بە مێشك گەیشتووە ژێری ناوەوە هەڵدەستێ بە چارەسەرکردنی و جێگیرکردن و چەسپاندنی لە بیروهۆش و قایم کردنی. بۆیە با ئەو چیرۆکانە بن کە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر صلی الله علیه وسلمو قورئان زیاتر دەکەن و دەخەنە دڵیان.

وەبۆ ئاسان کردنی ئەم کارە دەکرێ ئێمە بۆ فێرکردنی منداڵەکانمان و لەبەرکردنی قورئانی بەرزو بڵند پشت بە هێندێك ئامێری ئەلیکترۆنی سەردەم ببەستین، وەکو:

* لاپتۆپی منداڵان کە نزیکەی بیست (20) سوڕەتی کورت و چل (40) زیکر و دوعای سوننەتی تێدایە و بە پاتری قەلەم کاردەکات و نرخەکەی هەرزانە، وە هەیانە پێشکەوتووترە و سوڕەتی زیاتری تێدایە بەڵام نرخەکەی زیاترە.

* ئامێری ئەلیکترۆنی ($MP_3$) ئەگەر توانای خەزنی یەك (1) گێگا بایت بێ خەتمێکی قورئانی تەعلیمی لەسەر خەزن دەکرێ و شەوان بەر لە نووستن، یا هەر کاتێکی تری گونجاو با منداڵەکەت گوێی لێ بگرێ، کە

بەڕاستی من بۆ منداڵەکانم سوودێکی زۆرم لە هەردوو ئامێر بینیوە.

* مۆبایل: کە ئەمەشیان لەهێندێك حاڵەتدا سوودێکی باشی لێ وەردەگیرێ.

### 3- هەڵگرانی قورئان لە منداڵان[1]:

ناوی هێندێك لەو منداڵانە و ئەو کەسانەی هەر لە بچووکییەوە قورئانیان لەبەرکردووە باس دەکەین تا بزانین هەموو کارێك ئەگەر بۆ خواو لەبەر خوا بێ و هەوڵی بۆ بدەین خوا یارمەتیمان دەدا و هاتنەدی ئاسانە. وە هەروەها بەهیوای ئەوەی تا لە ڕێگای ئێوەوە ئەمە ببێتە هاندەرێك بۆ منداڵەکانتان:

* عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ڕەزای خوایان لێ بێ کە دەکاتە ئامۆزای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەر لە بچووکییەوە دەستی کردبوو بە لەبەرکردنی قورئانی ڕێنموونی کار[2].

* شافعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە حەوت (7) ساڵان هەموو قورئانی لەبەر بوو، وە (الموطأ)ی ئیمامی مالکی لە دە (10) ساڵان لەبەرکرد[3].

* سوفیانی کوڕی عویەینە ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە دە (10) ساڵی قورئانی لەبەر بوو[4].

* زوهری ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەتەمەنی دە(10) ساڵان بە ماوەی هەشتا(80) ڕۆژ هەموو قورئانی لەبەرکدووە.

---

(1) ئەوانە وەکو نموونەی مشتێکن لە خەرواریك.

(2) فضائل القرآن لإبن کثير باب تعلم الصبيان القرآن (225).

(3) صور ومواقف لمأمون فرزیز جرّار (65/8).

(4) هەمان سەرچاوە (65/8).

* موحەممەدی کوڕی حوسەینی تەباتەبائی لە ئێران: کە لە تەمەنی شەش ساڵیدا هەموو قوڕئانی بە ژمارەی ئایەت و لاپەڕە و تەفسیری ئایەتەکانیشەوە لەبەرکردووە[1].

* عەبدوڵڵای کوڕی جەبر لە میسر: کە تەمەنی نۆ (9) ساڵە و هەموو قوڕئانی لەبەرە، لەگەڵ دوو (2) هەزار فەرموودەی پێغەمبەری خوا –صلى الله عليه وسلم– و چەندان نامیلکەی تریش[2].

* فاتیمەی میر لۆخی لە ئێران: تەمەنی حەوت ساڵ و نیوەو هەموو قوڕئانی بە ژمارەی ئایەت و لاپەڕە و لەگەڵ زانینی سوڕەتە مەککی و مەدەنیەکان لەبەرە[3].

* وەهەروەها موحەممەد و مەظهری کوڕانی مەنصور کە یەکەمیان لە حەوت (7) ساڵانە و ئەویتریان لە نۆ (9) ساڵانە، کە پێشتر باسمان کردن.

وەئەگەر هەڵگرانی قوڕئان لە منداڵان بژمێرین و باسیان بکەین دەبێ لە نامیلکەیەکدا جێگایان بۆ بکەینەوە، بەڵام بە ئەوەندە وازدێنین، وە هیوادارین ئەم بابەتە سوود و کەڵکی پێگەیاندبن و ئەوانە و نموونەی ئەوانە بکەینە سەرمەشق و پێشەنگی منداڵەکانمان.

شاعیریش موحەممەدی کوڕی حوسەین – کە شەرع زانێکی مەزهەبی شافیعیە– دەڵێ[4]:

تعلم يا فتى والعود رطب ... وطبعك لين والدهر قابل

كفى بك يافتى شرفاً وفخراً ... سكوت الجالسين وأنت قائل



(1) كيف تصبح حافظاً للقرآن عبدالكريم جراد (ص 42).

(2) هەمان سەرچاوە (ل 42).

(3) هەمان سەرچاوە (ل 42).

(4) الاداب الشرعية والمنح المرعية لإبن مفلح المقدسي الحنبلي (1/ 236).

## خاڵی پێنجەم: کێ شایستەترە ئیمامەتی و بەرنوێژی بکا؟ ئەوەی قورئانی زیاتر لەبەرە (أقرأ) یان ئەوەی لە فیقە شارەزاترە (أفقه)؟

هەرچەندە ئەم بابەتە لەناوەڕۆکدا ئاماژە بە فەزڵ و گەورەیی هەڵگرانی قورئان دەکات بەڵام لەهەمان کاتیشدا بابەتێکی فیقهی ڕاهەڵگرەو پێویستە مسوڵمانان زانیارییان دەربارەی هەبێ و بزانن ڕاو بۆچوونی دروست و ڕاستتری زانایان سەبارەت بەم مەسەلەیە چییە، بۆیە بەچاکمان زانی لە خاڵێکی سەربەخۆ و بەجیا باسی بکەین.

زانایانی ئوممەت سەبارەت بەم پرسیارە دوو ڕاو بۆچوونیان هەیە[1]:

**ڕاوبۆچوونی مەزهەبی یەکەم:** ئەوەی قورئانی زیاتر لەبەرە شایستەترە لەوەی کە شارەزاترە بە فیقە، ئەمە بۆچوونی ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی و ثەوری و ئەحمەدە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ بەڵگەشیان:

*** بەڵگەی یەکەم :**

لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (( إذا كانوا ثلاثة فليؤمَّهم أحدهم وأحقهم بالامامة أقرؤهم ))[2] .

واتە (( ئەگەر سێ کەس بوون بایەکێکیان ئیمامەتیان بۆ بکا، وە لە هەموویان شایەنتر بە ئیمامەتی ئەوەیە کە قورئانی زیاتر لەبەرە)).



(1) بۆ ئەم بابەتە سوودێکی زۆرم لە (صحيح فقه السنة)ی (أبو مالك كمال بن السيد سالم) (521/1) وەرگرتووە.

(2) رواه مسلم (672).

*** بەڵگەی دووەم:**

**لە ئەبو مەسعودی ئەنساری ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (( يؤم القوم اقرؤهم لكتاب الله، فإن كانوا في القراءة سواء، فأعلمهم بالسنة، فإن كانوا في السنة سواء، فأقدمهم هجرة، فإن كانوا في الهجرة سواء فأقدمهم سلماً، ولا يؤمن الرجل الرجل في سلطانه، ولا يقعد في بيته على تكرمته إلا بإذنه))[1].**

**واتە: (( ئەوەی ئیمامەتی دەکا بۆ خەڵك با لە هەموویان زیاتر قورئانی لەبەر بێت، ئەگەر لە قورئان لەبەرکردندا یەکسان بوون، شارەزاترینیان لە سوننەتدا، ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەریشدا یەکسان بوون، لە پێشتریان لە کۆچ کردندا، ئەگەر لەوەشدا یەکسان بوون، لە مسوڵمان بووندا. نابێ پیاوێ ببێ بە ئیمام لە شوێنی دەسەڵاتی پیاوێکی تردا، وە لەسەر جێگەی تایبەتیشی نابێ دابنیشیت مەگەر بە ڕەزامەندی خۆی بێت)).**

**نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ( وفي حديث أبي مسعود دليل لمن يقوم بتقديم الاقرأ على الافقه، وهو مذهب أبي حنيفة وأحمد وبعض أصحابنا. وقال مالك والشافعي وأصحابهما: الأفقه مقدم على الأقرأ...)[2].**

**واتە:( فەرموودەی ئەبو مەسعود بەڵگەیە بۆ ئەوانەی (اقرأ) پێش (افقه) دەخەن، کە ئەمەش مەزهەبی ئەبو حەنیفە و ئەحمەد و هێندێك لە هاوەڵانمانە. وە مالك و شافعی و هاوەڵانیان دەڵێن: (افقه) پێش (اقرأ) دەخرێ...).**



(1) رواه مسلم (673)، والترمذي (235، 773)، وأبو داود (582 و 583 و 584)، والنسائي (2/ 76- 77)، وأحمد في المسند (4/ 118 و 121).

(2) شرح صحيح مسلم للنووي (5/ 172).

*** بەڵگەی سێ یەم:**

لە عەمری کوڕی سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((...صلّوا صلاة كذا في حين كذا، وصلّوا صلاة كذا في حين كذا، فإذا حضرت الصلاة فليؤذن أحدكم وليؤمكم أكثركم قرآناً)). فنظروا فلم يكن أحد أكثر قرآناً مني، لما كنت أتلقى من الركبان، فقدموني بين أيديهم وأنا ابن ست أو سبع سنين[1].

واتە: ((...فلأنە نوێژ لە فلأنە کات بکەن، وە فلأنە نوێژ لە فلأنە کات بکەن. جا ئەگەر کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بدا و ئەوەی لە هەمووتان زیاتر قوڕئانی لەبەرە با ئیمامەتیتان بۆ بکا)). جا ئەوانیش ڕوانیان کەسێکی تر نەبوو جگە لە من قوڕئانی زیاتر لەبەربێ، لەبەرئەوەی من لە قافڵە و کاروانچی‌یەکان قوڕئانم وەرگرتبوو، ئیدی بۆ ئیمامەتی پێشیان خستم کە من لەو کاتەدا شەش یان حەوت ساڵان دەبووم ).

*** بەڵگەی چوارەم:**

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێ دەڵێ:( لما قدم المهاجرون الأولون العصبة- موضع بقباء- قبل مقدم رسول الله صلى الله عليه وسلم كان يؤمهم سالم مولى أبي حذيفة، وكان أكثرهم قرآناً)[2].

واتە: ( کاتێك کۆمەڵی کۆچبەرە یەکەمەکان- دەستەی یەکەم- هاتن بۆ عوصبە- شوێنێکە لە قوباء- و پێش هاتنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ مەدینە سالم کە کارگوزاری ئەبو حوزەیفە بوو ئیمامەتی بۆ دەکردن، کە لە هەموویان زیاتر قوڕئانی لەبەر بوو).



(1) رواه البخاري (4306)، وأبو داود (585)، والنسائي (80/2)، وأحمد (3/ 475).

(2) رواه البخاري (692).

**ڕاو بۆچوونی مەزهەبی دووەم:** شارەزا بە فیقه شایەن ترە پێش بکەوێ لە کەسێك کە قوڕئانی زیاتر لەبەرە، کە ئەمەش بۆچوونی مالك و شافعیە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ بەڵگەشیان:

*** بەڵگەی یەکەم:**

دوور نیە ئەو کەسەی ئیمامەتی دەکا ئەگەر هەڵەیەك، یان کارێك بکا و لە فیقه شارەزا نەبێ نەزانێ چۆن چارەی بکا، بۆیە فەقیه شایەن ترە.

*** بەڵگەی دووەم:**

ئەم مەزهەبە وەڵامیان سەبارەت بە لێکدانەوەی فەرموودەکانی مەزهەبی یەکەم ئەوەیە کە: (أقرأ) لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە هەمان کاتیشدا (افقه)یش بوون، چونکە ئەوان دە (10) ئایەتیان لەبەر نەدەکرد تا چاك لێی تێنەگەیشتبوونایە و کاریان پێنەکردبووایە.

ڕاو بۆچوون و مەزهەبی یەکەم لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێن: لە فەرموودەی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم کە فەرموویەتی: ((فإن كانوا في القراءة سواء فأعلمهم بالسنة)) بەڵگەی ڕەهایە لەسەر پێشخستنی (أقرأ).

*** بەڵگەی سێیەم:**

پێشخستنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتی نەخۆشیەکەی بۆ ئەبوبەکر تا نوێژ و ئیمامەتی بۆ خەڵکی بکات، هەرچەندە ئەبوبەکر لە هەموان زیاتر قوڕئانیشی لەبەر نەبوو.

مەزهەبی یەکەم لەوەڵامی ئەمەدا دەڵێن: پێشخستنی ئەبوبەکر ئاماژەیە بۆ جێنشین کردن و کردنی بە خەلیفە لە دوای خۆی، خەلیفەش شایەن ترە ئیمامەتی بکا، هەرچەندە غەیری ئەو قوڕئانیان زیاتر لەبەر بێ.

ئـەبو حەسـەنی ئەشـعەری ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ دەڵـێ: ( قـد عُلـم بالاضطرار أنّ رسول الله صلى الله عليـه وسـلم قـدّم أبـابكرٍ في مـرض المـوت ليصلي بالنّاس، وقـد ثبـت في الخـبر المتـواتر أنّ رسـول الله صـلى الله عليـه وسلم قال: (ليؤم النـاس اقرؤهم). فلو لم يكن الصدّيق أقرأ القوم، لمَا قدّمـه عليهم)[1].

واتـە: ( بەڕاسـتی زانـراوە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم لـە نەخۆشی وەفاتیدا ئەبوبەکری پێشخسـت تـا ئیمامـەتی بـۆ خـەڵکی بکـات، وە بێگومان لە خەبەری تەواتوریشدا هـاتووە کـە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (( با ئەو کەسە ئیمامەتی بـۆ خـەڵکی بکـات کە لە هەموویان قورئانی زیاتر لەبەرە)). جا ئەگەر ئەبوبەکر لە هـەموویان قورئـانی زیـاتر لەبەرنەبووایـە ئـەوا پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم پێش ئەوانی نەدەخست).

## ڕاو مەزهەبی دروست و ڕاست:

ئـەوەی قورئـانی زیـاتر لەبـەرە شـایەنترە ئیمامـەتی بکـا، بـەڵام دەبـێ شـارەزایی لـە ئەحکامـەکانی نوێـژ هـەبێ، بۆئـەوەی لـەکاتی کردنـی هـەر هەڵەیەك لە نوێژدا بزانێ چی لەسەر پێویستە تا ئەنجامی بدا.

---

(1) فضائل القرآن لابن كثير (ص54).

ئیماندارانی هەریەکەیان بە ئەندازەی ئەوەی
قورئان دەناسن ئەوا خۆیان لەگەڵی ماندوو دەکەن و
هەوڵی فێربوونی دەدەن و دەیخوێننەوەو لە سینگیاندا
کۆی دەکەنەوە

بەشی دووەم

# بنچینە و یاسایەکی سەرەکی یەکان

# بۆ لەبەرکردنی قورئانی لێزان و کاربەجێ

لەم بەشەدا[1] بە پشتیوانی خوای گەورە باسی چەند بنچینەو یاسایەك دەکەین کە بۆ کاتی لەبەرکردنی قورئانی مەزن پێویستن و یارمەتی‌یەکی باشن بۆ چاکتر جێگیربوون و زیاتر مانەوەی قورئانەکە لە بیروهۆشدا، کە گرینگترینیان ئەمانەن:

**بنچینەی یەکەم:**

## دڵسۆزی و تەنها خوا مەبەست بوون کلیلی کرانەوەی بەخششەکانی خوایە لە دونیا و سەرفرازییە لە دواڕۆژ

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ...﴾[2]

وەدەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾﴾[3]

---

(1) سوودێکی زۆرم لە (كيف تحفظ القرآن الكريم) ی دکتۆر (يحيى الغوثاني) وەرگرتووە.

(2) سورة الزمر (1-3).

(3) سورة البينة (5).

هەرکەسێك دەیەوێ خوای گەورە زیاتر بەخشش و نیعمەتەکانی خۆی پێ ببەخشێ، با لە هەموو خواپەرستی‌یەکدا خۆی بۆ خوا یەکلا بکاتەوە، بەتایبەتی لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن کە فەرموودە و کەلامی خۆیەتی. جا هەرکەسێك قورئان لەبەر بکا تا پێی بڵێن: هەڵگری قورئانە و لەناو خەڵکی‌دا شانازی و ڕیایی پێوە بکا و لەم کارەی‌دا مەبەستی خوای گەورە نەبێ ئەوا هیچ پاداشتێکی بۆ نی‌یە، بەڵکو لەسەریشی قەرزار دەبێتەوەو بە گوناهکار و تاوانباریش دەژمێررێ، وە لە ڕۆژی دوایدا سزای توندی بەسەردا دەدرێ، هەروەکو لە بەرگی یەکەم لە ئادابە گشتی‌یەکانی خوێندنەوەی قورئان ئاماژەمان پێکرد و چەند نمونەیەکمان لەسەر هێنایەوە.

## بنچینەی دووەم:

### لەبەرکردن لە بچووکی و منداڵی‌یەوە وەکو نەخشی سەر بەرد وایە

یەکێك لە نیعمەتە هەرە مەزنەکانی خوای گەورە بەسەر بەندەکانیدا ئەوەیە کە هەر لە بچووکی‌یەوە بیانسازێنێ بۆ لەبەرکردنی قورئان و فێربوونی زانست و زانیاری، ئەمەش لەبەرئەوەی فێربوون لە بچووکی‌یەوە چەندان سوود و کەڵکی نایابی هەیە، لەوانە:

1- منداڵ و نەوجەوانەکان دڵ بەتاڵ تر و کات زیاتر و بیر تیژترن، بە پێچەوانەوە بە تەمەنەکان بەم ئەندازەیە نین، بۆیە منداڵەکان ئەوەی فێری دەبن یەکسەر لە دڵ و مێشکی‌یان دەچەقێ و بە ئاسانی لە بیریان ناچێتەوە.

لە حەسەنی بەسرییەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (العلم في الصغر كالنقش في الحجر)[1].

واتە: (فێربوونی زانست لە بچووکییەوە وەکو نەقشی سەر بەرد وایە).

وە عەلقەمە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (ما تعلمته وانا شاب، فكأنما اقرؤه من دفتر)[2].

واتە:(ئەوەی فێری بووم لە گەنجایەتیم بوو، بۆیە هەروەکو بلێی لەسەر دەفتەر دەیخوێنمەوە).

2- لەبەرکردنی قورئان و شارەزابوون لە ئایین کات و ڕۆژگارێکی زۆری پێویستە، بۆیە ئەگەر لە بچووکییەوە نەبێ ناتوانرێ دەست بەسەر زۆربەی دابگیرێ.

تێبینی: لەبەر گرنگی فێربوون لە بچووکییەوە زۆر لە زانایان لە کتێب و نووسراوەکانیاندا توێژینەوە و باسیان لەسەر کردووە و گرنگییان پێداوە، لەوانە:

* فتح الباري شرح صحيح البخاري (1/ 166).
* الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي (2/ 79).
* أدب الدنيا والدين لإبن الحسن الماوردي (57)
* جامع بيان العلم في باب: فضل التعلم في الصغر والحض عليه لإبن عبدالبر (1/ 81).
* المقدمة لإبن خلدون (537- 538).
*وەهەروەها چەندان سەرچاوەی تریش هەن.

---

(1) الآداب الشرعية والمنح المرعية لإبن قدامة المقدسي (1/ 244).

(2) هەمان سەرچاوە (1/ 244).

## بنچینەی سێ یەم:

## هەڵبژاردن و دیاری کردنی کاتێکی لەبارو گونجاو بۆ لەبەرکردن

سێ (3) کات هەیە کرداری لەبەرکردن تێیدا زۆر باشە:

**کاتی یەکەم: پارشێو (السحر): لەبەرکردن لە پێش بانگی بەیانیدا بە نایابترین کاتی لەبەرکردنی قورئانی پایەدار دادەنرێ، کە لەم کاتەدا دڵەکان ساف و پاك و بێگەردن و بەتاڵن لە سەرقاڵی و کێشەکانی دونیا، وە کاتی دابەزینی بەزەیی خوا و جێبەجێکردنی داواکاریەکانە، وە کاتی پەیوەندی کردنی خەڵکی زەویە بە دروستکارەکەیان، وەکو لەم چەند بەڵگانەدا کە باس لە بەرەکەت و گرنگی ئەم کاتە دەکەن:**

*** لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (يَنْزِلُ ربُّنا تبارك وتعالى كلّ ليلة إلى سماء الدنيا حين يبقى ثلثُ الليلِ الأخير يقول: مَنْ يدعوني فأستجيب له، من يسألني فأعطيه، من يستغفرني فأغفر له)[1].**

**واتە: (پەروەردگاری موبارەك و بەرزمان هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا[2] کەهێشتا سێیەکی کۆتایی شەو ماوە دەڵێ کێ هاواروبانگم دەکا تا وەڵامی بدەمەوە، کێ داوام لێدەکا تا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێدەکا تا لێی خۆش ببم).**

*** ئیبنو جەماعە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (اجود الاوقات للحفظ الاسحار)[3].**

**واتە: (نایابترین کاتی لەبەرکردن: پاش شێوە).**



---

(1) رواه البخاري (1077) باب: الدعاء في الصلاة من اخر الليل.

(2) هاتن و دابەزینێك کە هەر لایەقی خۆی بێت، ئێمە چۆنیەتەکەی نازانین.

(3) تذكرة السامع والمتكلم في العالم والمتعلم لإبن جماعة (ص72).

* خەتیبی بەغدادی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (إعلم أن للحفظ ساعات ينبغي لمن أراد التحفظ أن يراعيها، فأجود الاوقات: الاسحار...

وقيل لبعضهم: بم أدركت العلم؟ قال: بالمصباح والجلوس الى الصباح. وقال آخر: بالسفر والسهر، والبكور في السحور)[1].

واتە: (بزانە: بەڕاستی بۆ لەبەرکردن چەند کاتێك هەن کە پێویستە ئەو کەسەی لەبەرکردن ئەنجام دەدا ئاگاداریان بێ و چاوی لێیان بێ، جا نایابترین کات پارشێوە....

وەبە کەسانێك گوترا: بەچی بەم زانستە گەیشتی؟

گوتی: بەمۆم و چرا و دانیشتن تا بەیانی. وە یەکێکیتر گوتی: بە سەفەر و شەونخونی و زوو هەستان لەخەو لە پارشێو).

لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو ئوەیس ڕەحمەتی خوای لێ بێ گوتویەتی: (إذا هممت أن تحفظ شيئاً فنم، وقم عند السحر فأسرج وانظر فيه، فإنك لاتنساه بعد إن شاء الله)[2].

واتە: (ئەگەر ویستت نووسراوێك یا شتێك لەبەربکەی ئەوە بخەوە، وە لەکاتی پاش شێو زوو هەڵبستە و چرایەکە دابگیرسێنە و تەماشای نووسراوەکە بکە و بخوێنەوە، بێگومان بە جۆرێکی وا لەبەری دەکەی کە بەویستی خوا هەرگیز لەبیری نەکەی).

**کاتی دووەم: بەرەبەیانێکی زوو (الفجر):** کە ئەمەش نزیکە لە کاتی پارشێو، زانستی ئێستاش ئەوەی دۆزیوەتەوە کە باشترین کات بۆ پێدانی خواردن بە دەماخی مرۆڤ بەرەبەیانێکی زووە، چونکە لەم کاتەدا گازی



---

(1) الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي (2/ 103).

(2) الجامع في الحث على حفظ العلم تحقيق أبي عبدالله الحداد (177).

ئۆزۆن $O_3$ لە چینەکانی خوارەوەیە لەسەر زەوی و زۆر بەکەڵکە بۆ دەماخ.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ۝١٨﴾[1]. واتە: (وە سوێند بە بەرەبەیان کە هەناسە دەدات).

* پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((اللهم بارك لأمتي في بكورها))[2].

واتە: ((خوایە لە بەرەبەیان و زوو لە خەوهەستانی ئوممەتەکەم پیت و فەڕ و بەرەکەت بخە ئیش و کارییان)).

**کاتی سێ یەم: کاتژمێرێك بەر لە نووستن:** کە ئەمەشیان یەکێکە لە کاتە نایابەکان بۆ لەبەرکردن، چونکە ئەوەی تۆ لەبەری دەکەی یان دەخوێنیتەوە پاشان دەخەوی ژێری ناوەوە خەزنی دەکا و هەڵدەستێ بە شیکردنەوەی و پاشان جێگیر و قایم کردنی لە بیروهۆش.

**کاتی چوارەم:** چەند کاتێکی تریش هەن کە گونجاون بۆ لەبەرکردنی قورئانی مەزن، بەڵام وەکو ئەوانەی ڕابردوو باس کران زۆر باش نین، بۆیە بە پێویستی نازانین باسی لێوە بکەین.

**تێبینی:** کاتەکانی لەبەرکردن لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی‌تر دەگۆڕێت، بۆیە هەرکەسێك لە چ کاتێکدا دەتوانێ باشترین و چاکترین لەبەرکردن ئەنجام بدات با لەو کاتەدا دەست بە لەبەرکردن بکات.



---

(1) التكوير (18).

(2) رواه أبو داود (2606)، والترمذي (1212)، وأحمد في المسند (3/ 416 ، 432 ، 384/4 ، 390، 391)، وابن ماجه (2236)، صحيح الجامع للألباني (1311).

## بنچینەی چوارەم:

### هەڵبژاردن و دیاری کردنی شوێنێکی شیاو بۆ لەبەرکردن

هەڵبژاردنی شوێنێکی شیاو و لەبار کە یارمەتی لەبەرکردنی قورئانی مەزن بدا خۆی لە چەند مەرجێکدا دەبینێتەوە، کە ئەمانەن:

مەرجی یەکەم: هێمنی و تیشك و ڕووناکی‌یەکی مام ناوەندی: کە دووربێ لە ژاوەژاو و تیشکی بەهێز، چونکە ئەمانە ووریاکەرەوەن و ژیری لە لەبەرکردن سەرقاڵ دەکەن.

مەرجی دووەم: هەوای پاك و خاوێن و گۆڕاوی هەبێ: کە زیندوو کەرەوەی ژیری و لاشەن و چالاکیان دەکات.

مەرجی سێیەم: شوێنەکە چوارچێوەیەکی دیاری‌کراوی هەبێ و دووربێ لە سەرقاڵی و دیمەن و نەخش و نیگار تاوەکو چاوەکان نەکەونە سەریان و بەهۆیەوە بیروهۆش پەرش و بڵاو نەبێ.

دیارە چاکترین جێگاش مزگەوتە کە نە چاوەکان حەرام دەبینێ، وە نە گوێ‌یەکان شتێك دەبیستن کە خوا پێی ناڕازی بێ، وە زمانیش بەخێر نەبێ ناگەڕێ.

2

## بنچینەی پێنجەم:

## چاك خوێندنەوەی قورئان و بە ئاوازێكی خۆش و بەدەنگێكی بیستراو ئایەتەكان دامەزراوتر دەكات لە بیروهۆش

ئەم بنچینەیە سێ (3) بابەت لەخۆ دەگرێ:

* **بابەتی یەكەم:** چاك خوێندنەوەی قورئان (تجوید): كە سوپاس بۆ خوا مامۆستایانی خەمخۆر- خوا پاداشتی چاكەیان بداتەوە- نامیلكە و كتێبی زۆریان لەم بارەیەوە بە كوردی نووسیوە، پێویست ناكا ئێمە باسی بكەین.

* **بابەتی دووەم:** خوێندنەوەی قورئان بە ئاوازێكی خۆش: لە بەرگی یەكەم لە ئاداب و ڕەوشتە گشتییەكانی خوێندنەوەی قورئان ئەم بابەتەمان بەتێر و تەسەلی تاوتوێ كرد.

* **بابەتی سێیەم:** دەنگ هەڵبڕین لەكاتی خوێندنەوە و لەبەركردنی قورئان:

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((ما أذن الله لشيء ما اذن لنبيٍّ حسن الصوت يتغنى بالقرآن يجهر به))[1].

واتە: ((خوا لە هیچ شتێك وا بەچاكی گوێ ناگرێ وەك گوێ دەگرێ لە پێغەمبەرێكی دەنگ خۆش- یا لە قورئان خوێنێكی دەنگ خۆش- كە بە ئاوازێكی جوان و خۆش قورئان بخوێنێ و بە شەوقەوە دەنگی لێ هەڵبڕێ)).

ئەبو هیلالی عەسكەری دەڵێ: (وينبغي للدارس أن يرفع صوته في درسه حتى يسمع نفسه فإن ما سمعته الأذن رسخ في القلب، ولهذا كان الانسان اوعى لما يسمعه منه لما يقرأه...)[2].

---

(1) رواه البخاري (5023)، و مسلم (972).

(2) الحث على طلب العلم والاجتهاد جمعة أبو هلال العسكري (37).

واته:(پێویسته خوێنەر لە دەرس و خوێندنەوەیدا دەنگ هەڵبڕێ هەتا بۆخۆی بیبیستێ، چونکه ئەوەی گوێ دەیبیستێ لە دڵ دادەمەزرێ و جێگیر دەبێ، بۆیە مرۆڤ ووشیارترە لەوەی لە خۆی دەیبیستێ نەوەکو لەوەی دەیخوێنێتەوە...).

زوبەیری کوڕی بەککار دەڵێ: (دخل عليّ أبي وانا أروي في دفتر ولا أجهر، أروي فيما بيني وبين نفسي، فقال لي: إنما لك من روايتك هذه ما ادّى بصرك الى قلبك، فإذا أردت الرواية، فانظر اليها واجهر بها، فإنه يكون لك ما ادّى بصرك الى قلبك، وما ادّى سمعك الى قلبك)[1].

واته: (باوکم هاته لام و لەوکاتەدا من دەفتەرەکەم دەخوێندەوەو دەنگم لەگەڵ هەڵنەدەبڕی، بەڵکو لەدڵی خۆمدا دەمخوێندەوە، جا پێی گوتم: لەمەدا تەنها چاوەکانت نووسراوەکە بە دڵت دەگەیەنن، جا ئەگەر دەتەوێ ریوایەتەکە لەبەربکەی و چاکتر تێیبگەی سەیری بکە و دەنگت لەگەڵیدا هەڵبڕە تاوەکو چاو و گوێیەکانت پێکەوە نووسراوەکە بە دڵت بگەیەنن).

**پوختەی قسان:** ئەگەر ئەو قورئانەی تۆ دەیخوێنیتەوە و لەبەری دەکەی لەگەڵیدا دەنگ هەڵبڕی و ئاوازێکی خۆشی پێبدەی و ڕەچاوی یاساکانی تەجوید بکەی کەمتر زمانت دەچێتە سەر هەڵەکردن، بەڵکو زۆرجار هەستیش بە هەڵەکان دەکەیت و پێیان دەزانیت، وەلەکاتی مراجعەو پێداچوونەوەدا هەمان ئەو دەنگ و ئاواز و تەجویدەی کاتی خۆی لە لەبەرکردندا بەر گوێیەکانت کەوتبوو ئێستاش لە گوێیەکانتدا دەزرینگێتەوەو وادەکا زمانت هەڵەکان قبوڵ نەکا، وەلە هەمان کاتیشدا بتپارێزێ لە کەوتن و بازدانی هەر ووشەیەك ئەگەر بە سەهووش بێ.

---

(1) الجامع في الحث على حفظ العلم إنتقاء أبي عبدالله الحداد (174).

## بنچینەی شەشەم:

### لەبەرکردنی قورئان لەسەر یەك جۆرە چاپ

قورئانی مەزن زۆر جۆرە چاپ و شێوەی هەن، بۆیە دەبێ کرداری لەبەرکردن لەسەر یەك جۆر قورئان ئەنجام بدرێ و بە هیچ شێوەیەك ئاڵوگۆڕی پێنەکرێ، مەگەر بە قورئانێکی وەکو خۆی لە چاپ، چونکە ئەو قورئانەی تۆ کە لەبەری دەکەی لە ئاوێنەی بیروهۆشتدا وێنە و شوێنی ئایەتەکان خەزن دەبێ و وەکو شاشەی تەلەفزیۆن دێتە بەرچاوت، جا بە گۆڕین و نەمانی ئەو قورئانەی کە کرداری لەبەرکردنت لە سەرئەنجام داوە وادەکات شوێن و وێنەی ئایەت و سورەتەکان لەبیر و هۆشتدا بشێوێنێ، یان هەر بە یەکجاری نەیهێڵێ و بیسڕێتەوە.

## بنچینەی حەوتەم:

### پەیوەست بوون بە مامۆستایەکی قورئان لەبەر

یەکێك لە بنچینە و پایە سەرەکیەکان لە کرداری لەبەرکردنی قورئانی مەزن پەیوەست بوونە بە مامۆستا، ئەم پەیوەندی و پابەندبوونەش گرنگەو پێویستە لێی بێئاگا نەبین و لەبیرمان نەچێ، چونکە بەڕاستی قورئان لەبەرکردن تەنانەت بۆ عەرەبەکانیش کارێکی کەم بایەخیە مامۆستای نەبێت، چ جای غەیری عەرەب، وە لە حەقیقەتیشدا هەروایە، دەبینین قورئانی مەزن زۆر ووشەی هەن کە بەو شێوەیەی نووسراوە وەها ناخوێندرێتەوە، وە زۆر یاسای تەجوید هەیە دەبێ دەم بە دەم وەربگیرێ، وە... هتد. وە بە ئەزموون و تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە ئەگەر قوتابی لە کرداری لەبەرکردن مامۆستای هەبێ ئەوا سەرکەوتووتر و ئەنجامەکەی بەرهەمدارتر بووە.

وەبۆ هەڵبژاردنی مامۆستای باش چەند بنچینەیەك هەیە کە دەبێ لە مامۆستادا بێتە دی:

* خاوەن ئیمان و عەقیدەیەکی ڕاست و دروست بێ.
* تەقواو لەخوا ترسان و وەرەعی هەبێ.
* هەوڵ بدا بۆ چاك کردنی کۆمەڵگا.
* قورئانی چاك ڕەوان و لەبەرکردبێ.

چونکە پێش ئەوەی مامۆستا بێتە قسە و گفتوگۆ بکا، ڕەوشت و هەڵس و کەوتی جوان مامۆستای یەکەمن.

قابسی دەڵێ: (وقد مضى أمر المسلمین أنهم یعلمون أولادهم القرآن ویأتونهم بالمعلمین)[1].

واتە: (وە بێگومان لە ئیش و کاری مسوڵمانان هەر ئاوا هاتووە کە منداڵەکانیان فێری قورئان بکەن وبیانبەنە خزمەت مامۆستایان).

ڕۆڵ و گرنگی مامۆستاش لەمانەی خوارەوە خۆی دەبینێتەوە:

1- ڕاست کردنەوەی هەڵەی قوتابی لەکاتی بە هەڵە خوێندنەوەی قوتابی.
2- تەواو جێبەجێکردنی حوکمەکانی تەجوید.
3- وووریاکردنەوە لە ئایەتە وێکچووەکان.
4- چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی قوتابی دەبنەوە لە لەبەرکردن و ئامۆژگاری کردنی بۆ ئاسانترین ڕێگا.
5- هاندان و گوڕ و تین تێخستن بۆ بەردەوام بوون لەسەر لەبەرکردن.
6- پەیوەست کردنی لەبەرکردن بە تێگەیشتن و کارپێکردنی.

---

(1) آداب المتعلم في الفكر التربوي الاسلامي لأحمد محمد فلاته (ص97).

حەبیبی کوڕی شەهید بە کوڕەکەی دەڵێ: (یا بني! صاحب الفقهاء والعلماء، وتعلّم منهم و خذ من ادبهم فأنَّ ذلك أحب إليَّ من كثير من الحديث).

واتە:( ڕۆڵەگیان! هاوڕێیەتی شەرع زان و زانایان بکە، وە لێیان فێرببەو لە ڕەوشتیان سوود وەربگرە، چونکە بەڕاستی ئەمە لەلای من خۆشەویسترە لە فێربوونی فەرموودەی زۆر).

**بنچینەی هەشتەم:**

## باش خوێندنەوەی قورئان و ڕاست کردنەوەی هەڵەکان

پێش ئەوەی دەست بکەی بە لەبەرکردنی قورئانی مەزن دەبێ خوێندنەوەکەت لەلای مامۆستایەکی پسپۆڕ لەم بوارەدا ڕاست بکەیەوە، ڕاستکردنەوەکەش دەبێ ڕاستکردنەوەی هەموو بوار و لایەکانی قورئانی مەزن لەخۆ بگرێ:

1- ڕاست کردنەوەی دەربڕین و دەرچوونی ووشەکان و شێوە و سیفەتی پیتەکان: بەوەی هەموو پیتێك لە کاتی دەرچوونیدا هەقی خۆی پێبدەی و وەکو خۆی دەریببڕی، وەکو: (سُمَّ) لەجیاتی ﴿ ثُمَّ ﴾، وە (الَّزین) لەجیاتی ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾.

2- پاراستن و ڕێکخستنی پیتەکان: لە تێکەڵ کردنی سەرە (فتحة) و ژێرە (کسرة) کە دەبێتە گۆڕینی واتای ئایەتەکان و پێش و پاشکردنی واتا و ڕێزمانی ووشەکان، وەکو هێندێکیان ئەم ئایەتە: ﴿ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّ ﴾ بە (... ابراهیمُ ربه ) دەخوێننەوە.

3- پاراستن و ڕێکخستنی ووشەکان: بەوەی پیتەکانی ووشەکان بەیەك تەرز و شێوە و بێگۆڕان و بە یەکسانی قسە پێبکەی، وەکو ئایەتی: ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ﴾[1] بە یاء دەخوێننەوە. یان ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾[2] کە هێندێکیان بە یاء واتە (دعاني) دەخوێننەوە.

4- ڕاست کردنەوەی ئاوازی شاراوە: کە بریتی‌یە لە پڕکردن و تێرکردنی حەرەکەکان و خوێندنەوەیان بە شێوەیەکی ڕاست، بە واتایەکی تر: هەریەکە لە بۆر (ضمة) و سەرە (فتحة) و ژێرە (کسرة)... هتد، لە خوێندنەوەدا تێریان بکەی و هەقی تەواویان پێ بدەی، وەکو ووشەی (جِئْتَ) لەم ئایەتەدا: ﴿فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾﴾[3] کە هێندێك کەس کەسرەی جیمەکە دەکەنە (سکون) و جوان دەری نابڕن.

5- تەواو جێبەجێکردنی یاسا و حوکمەکانی تەجوید.

تێبینی: ئەگەر بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەکان نەکرا مامۆستایەك سەرپەرشتی خوێندنەوەکەت بکا، دەکرێ خەتمی قورئانخوێنێك بەکاربهێنی.



---

(1) المائدة (3).

(2) البقرة (186).

(3) الكهف (71).

## 2 بنچینەی نۆیەم:

## پەیوەندکردن و بەستنەوەی ئایەتەکان بە یەکتری

نەهاتنە سەر زمان و پچڕان لە کاتی خوێندنەوەی ئایەتەکان و هێندێك جار لەبیرچوونەوەیان یەکێکە لە کێشە و گیروگرفتی قوتابیانی لەبەرکەری قورئانی مەزن، بۆیە پێویستە قوتابی هەر ئایەتێك یا سوڕەتێك لەبەردەکا بیبەستێتەوە بە سەرەتای ئایەت یان سوڕەتەکەی دوای خۆی. ئەگەر وات کرد ئەوا لەکاتی خوێندنەوەدا بەبێ ویست و بەشێوەیەکی نالەخۆ لە خوێندنەوەی ئایەتەکان بەبێ‌پچڕان و بەئاسانی بەردەوام دەبیت و بازدان بەسەر ووشە و ئایەتەکاندا ڕوونادات.

وەبەستنەوە و پەیوەندکردنی ئایەتەکان بەیەکتری چەند جۆرێکیان هەیە، کە هێندێکیان ئەمانەن:

1- بەستنەوەی ئایەتە یەك بە دوای یەکەکانی ناو یەك لاپەڕە.

بۆ نموونە: لە سوڕەتی کەهف ئایەتی ژمارە (5) لاپەڕە (294) کە بریتی‌یە لە: ﴿مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِآبَآئِهِمْۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ۝٥﴾ بە دەنگێکی بیستراو بخوێنەوە و بە خێرایی و بێ‌ڕاوەستان بیلکێنە بە سەرەتای ئایەتی دوای خۆی کە ئایەتی ژمارە شەش(6)ە: ﴿فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ۝٦﴾، ئەم کردارە چەند جارێك دووبارە بکەوە بە مەرجێك کەمتر نەبێت لە حەوت (7) جار، وەهەروەها ئایەتەکانی تریش بەم شێوەیە.

2- بەستنەوەی کۆتا ئایەتی لاپەڕەیەك بە سەرەتای ئایەتی یەکەمی لاپەڕەکەی دوای خۆی.

بۆ نمونە: لەهەمان سوڕەت ئایەتی ژمارە چوار(4) لاپەڕە (293): ﴿وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۝٤﴾ بەهەمان شێوەی ڕابردوو بلکێنە بە سەرەتای ئایەتی یەکەمی لاپەڕەی (294) کە بریتی‌یە لە: ﴿مَّا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ وَلَا لِأٓبَآئِهِمۡۚ كَبُرَتۡ كَلِمَةً تَخۡرُجُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ۝٥﴾.

3- بەستنەوەی کۆتایی سوڕەتێك بە سەرەتای سورەتەکەی دوای خۆی.

بۆ نمونە: ئایەتی کۆتایی سوڕەتی (بني اسرائيل): ﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي لَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدًا وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِي ٱلۡمُلۡكِ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلِيٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّۖ وَكَبِّرۡهُ تَكۡبِيرَۢا ۝١١١﴾ بە هەمان شێوەی ڕابردوو پەیوەند بکە بە سەرەتای سوڕەتەکەی دوای خۆی کە سوڕەتی کەهفە: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ۝١﴾.

**تێبینی: سوودەکانی جێبەجێ کردنی ئەم کردارە:**

1- لە کاتی خوێندنەوە و مراجعەی ئایەت و سوڕەتەکان جا چ لە نوێژ یان غەیری نوێژ دابێ پچڕان و وەستان دەگمەنە یاخود هەر نی‌یە.

2- وە لە کاتی خوێندنەوە و پێداچوونەوەی قوڕئان بازدان بەسەر ووشە و ئایەتەکان ڕوونادات، بۆ نمونە لە ئایەتی یەکەم بۆ ئایەتی سێیەم، یان لەناو یەك ئایەتدا ووشەیەك یاخود بڕگەیەك لەبیر ناکرێ و بەسەریدا بازنادرێ.

2

## بنچینەی دەیەم:

## بەشێوەیەكی گشتی لەبەركردنی هێواش و لەسەرەخۆ و ڕەچاوكردنی پلە پلەیی ( التدرج ) و بەشێوەیەكی هێدی هێدی باشترە لە لەبەركردنێكی بە تەكان و خێرا و بە پەلە پەل

هەبوونی پلەپلەیی و لە قەدەر بەرەی خۆ پێڕاكێشان لە هەموو بوارێكی فێربوون و فێركردندا پێویستە، بەڵام لە لەبەركردنی قورئانی بەپێزو بەڕێز زیاتر، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾[1].

واتە: (وە ئەوانەی بێباوەڕبوون دەیانگوت بۆچی محمد صلى الله عليه وسلم هەموو قورئانی بە یەكجار بۆ دانەبەزێنراوە، ئا بەو جۆرە- دامانبەزاندووە- بۆئەوەی دڵی تۆ- ئەی محمد- بەو قورئانە دامەزراوو بەهێز بكەین، وە- بەو بۆنەیەوە- بەردەوام بەجوانی دایدەڕێژین و دەیگەیەنین).

وەدەفەرموێ: ﴿ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ ﴾[2]

واتە: (وەقورئانمان بەش بەش كردووە و بۆت ناردووە تا بەشێنەیی و ئارامی و لەسەرەخۆیی و هێواشی بەسەر خەڵكیدا بیخوێنیتەوە، هەر ئێمەش بەم شێوەیە دامانبەزاندووە- كە تۆ ڕایدەگەیەنیت-).



(1) الفرقان (32).

(2) الإسراء (106).

پلەپلەیی دوو جۆری هەیە: پلەپلەیی لە چەندیەتی (الکم)، وە پلەپلەیی لە چۆنیەتی (الکیفیة). کە ئێمە لێرەدا تەنها ئەوەی یەکەمیان باس و پێناس دەکەین و دەڵێین: بریتی‌یە لەو ئەندازە وەرگرتن و لەبەرکردنەی کە بیروهۆش دەتوانێ وەریبگرێ و ڕاگیری بکا و نەهێڵێ بەهۆی زۆرییەوە عەقڵ و دەروون دووچاری ساردبوونەوەو وازهێنان بکات، چونکە لەبەرکردنی بە تەکان و هورووژم و خێرا بەرهەمی نابێ، وە ئەگەر هەبێ لەوانەیە کاتی و کەم بێ.

یونس دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئیبنو شەهاب پێی گوتم: (یا یونس لا تکابر العلم، فإن العلم أودیة فأیها اخذت فیه قطع بك قبل أن تبلغه، ولکن خذه مع الایام واللیالي، ولا تأخذ العلم جملة، فإن من رام أخذه جملة ذهب عنه جملة ولکن فشيء بعد الشيء مع الایام واللیالي)[1].

واتە: (ئەی یونس نەکەی بەربەرەکانی و ململانێ لەگەڵ زانست بکەی، چونکە زانست چەند دۆڵێکە لە کامەیان زانست وەربگری ئەوە تۆ دەبڕێ پێش ئەوەی تۆ ئەو ببڕی، بۆیە لەگەڵ ڕۆیشتنی شەو و ڕۆژ وەریبگرە، وە نەکەی هەمووی بەیەکەوە وەربگری، چونکە بە ڕاستی هەر کەسێك تێکڕا وەریبگرێ هەمووی تێکڕا لێدەڕوا، بەڵام شت دوای شت و لەگەڵ ڕۆیشتنی شەو و ڕۆژ وەریبگرە).

بۆ نمونە: تۆ بتەوێ بە ماوەیەکی زۆر کەم هەموو قورئان لەبەربکەی و ڕۆژانە پشك و بەشێکی زۆر لەسەر خۆت دیاری بکەی ئەوا بەڕاستی ئەم کارە بەزەحمەت ئەنجام دەدرێ، وەلەوانەیە هەر بۆت نەکرێ، لە دوایشدا دووچاری ساردبوونەوەو وازهێنان لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن دەبیت،

---

(1) جامع بیان العلم وفضله لأبن عبدالبر (104/1).

چونکە لەبەرکردنی قورئانت زۆر بەزەحمەت و ناخۆش هاتۆتە بەرچاو، بۆیە ئەوەی ڕۆژانە ئارەزووی لەبەرکردنی لاپەڕەیەك لە قورئانی مەزنی هەیە: با لاپەڕەکە بە هێواشی و لەسەرەخۆ بخوێنێتەوە، ئینجا بە هێمنی چەند بارەی بکاتەوە تاکو چاك لەبەری دەکاو باش لەبیروهۆشیدا دامەزراو و جێگیر دەبێ. وەبە ئەزموون و تاقیکردنەوە سەلمێنراوە ئەو ئایەت و سوڕەتانەی مسوڵمان بەووردی و هێواشی و لەسەرەخۆ لەبەری دەکا دامەزراو و ڕاگیرتر دەبن لە لەبەرکردنی کەسانێك کە پەیڕەوی ئەم بنچینەیە ناکەن، وەهەڵگرانی قورئانیش هەست بەوە دەکەن و ئەمە باش دەزانن، بەڵام پێویستە ئەوەش بڵێین کە لەبەرکردنی ڕوبعەحزبێك لە قورئان لە هەفتەیەکدا بە لەبەرکردنێکی لەسەرەخۆ دادەنرێ و پەلەی تێدانی‌یە، چونکە تۆ ئەگەر تەنها ڕۆژەکانی هەفتە جگە لەشەوەکانی لەسەر دوانزە(12) کاتژمێر بژمێری ئەوا هەشتاو چوار(84) کاتژمێرت لەبەر دەستە، با هەشتا (80) کاتژمێری بۆ بژێوی ژیان و سەرقاڵی و پشوو بێ، ئەوەیتر کە چوار(4) کاتژمێرە بەسە بۆ کەسانێك کە دەیانەوێ لەهەفتەیەکدا ڕوبعەحزبێك لە قورئان لەبەربکەن و پێداچوونەوەیەکی چاکی لەبەرکراوەکەیان بەبەردەوامی هەبێ، کە ئەمەش لە ڕاستیدا هێشتا کەم تەرخەمی‌یە بەرامبەر بە قورئان کە لە هەفتەیەکدا تەنها چوار(4) کاتژمێر بۆ قورئان تەرخان بکەین.

**تێبینی**: ئەم بنچینەیە کەسانی بەهرەدار ناگرێتەوە، کە دەتوانن لە ماوەی مانگێك وەیاخود چەند مانگێکدا هەموو قورئانی بەڕێز لەبەر بکەن، عەرەب گوتەنی: (لکل قاعدة شواذ).

واتە: (بۆ هەموو یاسایەك ڕیزپەڕێك هەیە).

**بنچینەی یازدەهەم:**

## لەبەرکردنی ڕێکخراو و ڕێکوپێکی ڕۆژانە یان هەفتانە چاکترە لە لەبەرکردنی پچڕ پچڕ

پەیوەستکردنی نەفس و دەروون بەشتێك لە سەرەتای هەرکارێکدا زەحمەتە، وەلەو شتانەی نەفس مەیلی بەلادا ناکاو هەوڵ دەدا خۆی پێوە پەیوەست نەکات لەبەرکردنە، کەچی ئەگەر مرۆڤ ناوی خوای هێنا و بیر و زەینی لەسەر لەبەرکردن ڕاهێنا ئەوە ئەم کارە لەلای دەبێتە شتێکی ئاسایی بەڵکو دەگاتە ئاستێك کە زۆر لای خۆشەویست دەبێ، جا لە بنچینە گرنگەکان لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن ئەوەیە نەفست پەیوەست بکەی بەوەی ڕۆژانە پشکی ڕێك و پێکت لە لەبەرکردن هەبێ، هەر کە دەستت کرد بە لەبەرکردن و وەسوەسەی شەیتانت بەلاوەنا و تۆزی تەمبەڵیت لە خۆت داماڵی ڕادێی لەسەر لەبەرکردن و وەکو خواردن و خواردنەوە دەبێتە بەشێك لە ژیانت.

ئەبو هیلالی عەسکەری دەڵێ: (كان أحمد بن الفرات لا يترك كل يوم إذا أصبح أن يحفظ شيئاً وإن قل).

واتە: (ئەحمەدی کوڕی فوڕات هەموو ڕۆژێك کە بەیانی دەکردەوە تا شتێکی لەبەرنەکردبا وازی نەدەهێنا ئەگەر کەمیش بوایە).

وەبۆ ڕێکخستنی کرداری لەبەرکردن ڕەچاوی ئەمانەی خوارەوە بکە:

1- بۆخۆت بەش و پشکێك لەماوەیەکی دیاریکراو دیاری بکە، ئیدی دوای ئەم ماوەیە پشوو بدە، پاشان دووبارە پشکێکی تر دیاری بکەو لەبەری بکە، وەهەروەها، ئەمە مامۆستایەك سەرپەرشتی ئەم کارەت بۆ بکا و لە ژێر چاودێری ئەو دابێ چاکترە.

2- لەکاتی مەلوولی و پەستی و بێزاری و بێتاقەتی لەبەرکردن ئەنجام مەدە، بەڵکو ئەگەر هەستت بە مەلوولی کرد وازبێنە و پشوو بدە، وەیان بڕۆ بۆ لای ئەو کارانەی ڕێگە پێدراون وەکو خوێندنەوەی چیرۆك و بەسەرهاتی بەسوود و شیعر و پەخشان، کە لەوانەیە لە میانەیاندا بێزاری و بێتاقەتییەکەت بڕەوێتەوە.

**بنچینەی دوازدەهەم:**

## کرداری چەند بارەکردنەوە (تکرار) لەبەرکردنە نوێیەکە دەپارێزێ لە لەدەست چوون و لەبیرچوون

خەڵکان جیاوازن لە توندوتۆڵ کردن و جێگیرکردنی ئەوەی لەبەری دەکەن، هەیانە بە چەند بارەیەکی کەم دەتوانن لەبەرکراوەکە دامەزراو و قایم بکەن، وەهەیانە ناتوانێ لەبەربکات تا زۆر دووبارەی نەکاتەوە، بۆیە ئەگەر دەتەوێ لەبەرکردنەکەت توندو تۆڵ بێ و بە ئاسانی لە بیرت نەچێتەوە ئەوا لەکاتی لەبەرکردن و دوای ئەوکاتەش بەتایبەتی بەر لە نوستن زۆر دووبارەی بکەوە، هەرچەندە ئەم کردارە ئیمانێکیبەهێزو وورەیەکی بەرزی دەوێو لە سەرەتادا ماندووت دەکات بەڵام لەدواڕۆژدا بەرهەمەکەی دەبینیو دەزانی ئەنجامدانی کارێکی پێویست بوو.

وەبابڕوانین بۆ ئەم ڕووداوە کە ئیبنو جەوزی لە حەسەن بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ:(قوتابییەك لەماڵەوەدا وانەکەی چەندان جار دووبارە دەکردەوە تا لەبەری بکا، پیرەمێردێك کە لە ماڵەوەیاندا بوو پێی گوت: سوێند بەخوا ئەوا من لە بەر زۆر دووبارە کردنەوەی تۆ لەبەرم کرد.



قوتابییەکە گوتی: کوا بۆم بخوێنەوە، یەکسەر بۆی خوێندەوە. ئیدی دوای چەند ڕۆژێك قوتابییەکە گوتی: ئەی پیرەمێرد: وانەکەی ئەوێ

ڕۆژێ لەبەرت کردبوو دووبارەی بکەوە.

گوتی: لەبەرم نەماوە و لەبیرم چووە.

قوتابییەکە گوتی: من لەکاتی لەبەرکردندا زۆر دووبارەم دەکردەوە تاکو وەکو تۆم بەسەر نەیەت)[1].

## بنچینەی سێزدەهەم:

## وورد بوونەوە لە ئایەتە وێك چووەکان

یەکێك لەو کۆسپ و تەگەرانەی کە هێندێك لە هەڵگرانی قورئان لە کرداری لەبەرکردندا دێتە پێشیان، وەیان لەکاتی پێداچوونەوەدا، وێك چوون و هاوشێوەبوونی هێندێك لە ئایەتەکانە بە یەکتری.

بۆیە مسوڵمان لە کاتی ئەنجامدانی لەبەرکردندا زۆر ووریا نەبێ ئەوا ئەو ئایەتانەی بەم شێوەیەن لێی تێکەڵاو دەبن و ئاڵۆزییەك دروست دەکەن وە باشترین ڕێگا بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم لەمپەرەدا ئەوەیە کە مامۆستایەکی قورئان لەبەری شارەزا و لێزان ڕێ نیشاندەرت بێ و ئاگادارت بکاتەوە لە کاتی لەبەرکردن و گەیشتن بەو شوێنانەدا.

بۆنمونە ئەم سێ(3) ئایەتە کە لەسێ(3) سورەتدایە:

یەکەمیان خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾﴾[2].



(1) الحث على حفظ العلم لإبن الجوزي (ص254).

(2) البقرة (49).

وەلەئایەتی دووەمدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَنجَيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ۖ يُقَتِّلُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿١٤١﴾ ﴾[1].

وەلەئایەتی سێیەمدا خوای گەورە لەسەر زمانی موسا پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ ﴾[2].

کە ئەم چەند جیاوازیانە لەم چەند ئایەتە وێک چووانەدا دەبینین:

1- ووشەی: ﴿ نَجَّيْنَاكُم ﴾ و﴿ أَنجَيْنَاكُم ﴾ و ﴿ أَنجَاكُم ﴾.

2- ووشەی: ﴿ يُذَبِّحُونَ ﴾ و﴿ يُقَتِّلُونَ ﴾ و﴿ وَيُذَبِّحُونَ ﴾.

3- دوو ئایەتی یەکەم و دووەم ڕاستەوخۆ لە فەرموودەی پەروەردگارمانەوەن، وە سێیەمیان خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەر موسا سەلامی خوای لێ بێ فەرموویەتی.

وەهەروەها ئەم سێ ئایەتە لەمانەی خوارەوە وەك یەكن:

1- کە دەفەرموێ: ﴿ مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ﴾.

2- وەکە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾.



---

(1) الأعراف (141).

(2) إبراهيم (6).

کەواتـە: بـۆ زاڵبـوون بەسـەر ئـەم حاڵەتـەدا دەبـێ پـەیڕەوی ئەمانـەی خوارەوە بکەیت:

1- کۆکردنەوەی ئایەتە وێك چووەکان و دیاریکردنی شوێنیان لە هەر سوڕەتێك، وە لەبەرکردنیان هەروەکو خۆیان[1].

2- دیـاریکردنی واتـای ئایەتـەکان بـەپێی شـوێنیان، وەجیاوازیـان لـە واتادا بەپێی شوێن و باسیان.

3- تەرکیز و ووردبوونەوە لەسەر جیاوازی واتای ئایەتە وێك چووەکان هـەر کاتێـك بەسـەریاندا ڕۆیـشتی، وە هـەموو جارێـك پێداچـوونەوەی هەموویان.

وە سـەبارەت بـە بڕگـەی کۆتـایی ئایەتـەکان وەکـو (عَزِيـزٌ حَكِيمٌ) ئـەوا پێویـستە ووریـابی لـە واتاکـەی و بیبەسـتیتەوە بەسـەرەتا و نـاوەڕۆك و مانای ئایەتەکە.

وەکو لەم نمونەیەدا:

ئەصـمەعی- کـە نـاوی عەبـدول مـەلیکی کـوڕی قوڕەیبـە- دەگێڕێتـەوەو دەڵێ من ئـەم ئایەتـەم دەخوێنـدەوە: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ والله غفور رحيم ﴾ وبجنبي اعرابي، فقال: كلام من هذا؟ فقلت: كلام الله. قال: أعد، فأعدت، فقال: ليس هذا كلام الله. فانتبهت فقرات ﴿ ...وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٣٨ ﴾. فقال: اصبت هذا كلام الله. فقلت: اتقرا



---

(1) بۆ زانیاری هەبوون و جێبەجێکردنی ئەم کردارە بڕوانە کتێبی: 1- (عون الرحمن في حفظ القرآن بزيادة فتح العنان في حمل القرآن)ی (أبي ذر القلموني) . 2- (دليل الآيات متشابهة الالفاظ في كتاب الله العزيز ) ی (د.سراج صالح ملائكة). کە ئەوەی دووەمیان چاکترە لە یەکەمیان.

القرآن؟ قال: لا. فقلت: فمن أين علمت؟ فقال: يا هذا عز فحكم فقطع فلو غفر ورحم لما قطع)[1].

واتـــــــه: ﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَـٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ... ﴾ بە سەهوو گوتم: ( والله غفور رحيم ). لەوکاتـەدا ئەعرابیيـەك لـە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، گوتی: ئەوە قسەی کێیە؟

گوتم: قسەی خوایە.

گوتی: دووبارەی بکـەوە. منـیش بـە هـەمان شـێوەی ڕابردوو دووبارەم کردەوە. گـوتی: ئـەوە فـەرموودەی خـوا نـیـیـە. ئیـدی کـە دیقەتمـدا زانـیم سەهووم کردووە، خوێندمەوە: ﴿ ...وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ ﴾.

جا گوتی: ڕاستت خوێندەوە ئەوە فەرموودەی خوایە.

منیش گوتم: قورئانت خوێندووە؟

گوتی: نەخێر.

گوتم: ئەی چۆنت زانی هەڵەم کردووە؟

گـوتی: ئـەی فـلان دەسـەلات و بڕیـار دەرکـردن، پاشـان بـڕین و جێبەجێکردن، جا ئەگـەر – لەمـەدا – بـەزەیی پێدا هاتبووایـە و ڕەحمـی پێکردبووایە نەیدەبڕی.



---

(1) الكشكول للبهاء العاملي (1/ 233).

## بنچینەی چواردەهەم:

## جوان ڕوانین و چاك دیقەت دانی ئایەتەكان لەكاتی لەبەركردن [1]

ڕوانین (النظر) ئەو ئامرازە سەرەكی‌یەیە كە كرداری لەبەركردنی لەسەر ڕاوەستاوە و دەتوانرێ پشتی پێ‌ببەسترێ، بۆیە دەبێ زیاتر لەكاتی لەبەركردن گرنگی بە ڕوانین بدرێ، چونكە وەكو لەپێشدا گوتمان چاوەكانی مرۆڤ وەكو ئامێرێكی وێنەگر وان، هەر شتێك بەدیقەت ببینێ بەبێ زیاد و كەم هەڵی دەگێڕێتەوەو لەبیروهۆش تۆماری دەكات.

بۆ نموونە ئەگەر تۆ بە ووردی ڕوانیتە ئایەتەكانی ئەو لاپەڕەیەی دەتەوێ لەبەری بكەی ئەوا شوێن و شێوە و وێنەی ئایەتەكان لە ئەرشیفی مێشك و بیروهۆشتەوە تۆمار دەكرێن، هەتا ئەگەر دوای سالّكیش دەربارەی ئایەتێك- كە لەو لاپەڕەیەی لەبەرت كردووە- پرسیارت لێبكەن ئەوە دێتەوە یادت كە ئایەتەكە لە لاپەڕەی لای ڕاستە یان لای چەپ، وە دەكەوێتە سەرەوەی لاپەڕەكە. یان خوارەوەی، وە یاخود ناوەڕاست.

ئەحمەدی كوڕی فوڕات دەڵێ: (لم نزل نسمع شيوخنا يذكرون أشياء في الحفظ، فأجمعوا انه ليس شيء أبلغ فيه إلا كثرة النظر) [2].

واتە: (بەردەوام لە مامۆستا و شێخەكانمان دەبیستین باس لە چەند شتێك دەكەن كە بۆ لەبەركردن باشە، ئیدی هەموویان كۆك بوون لەسەر ئەوەی هیچ شتێك نی‌یە چاكتربێ لە زۆر ڕوانین).

---

(1) بەڵام ئەوانەی نابینان و خوای گەورە بە دوو خۆشەویستەكەیان تاقی كردوونەتەوە ئەوا دەرووی خێری تری لێكردوونەتەوە و بەهۆی بیرتیژیان لە ئێمەی چاوساغ باشتر دەتوانن قورئان لەبەر بكەن، بۆیە ئەم بنچینەیە ئەوان ناگرێتەوە.

(2) (الجامع في الحث على حفظ العلم) انتقاء أبي عبدالله الحداد/ 177. نقلا من كتاب( كيف تحفظ القرآن الكريم) ليحى الغوثاني.

## بنچینەی پانزەهەم:

## پێکەوە بەستنی کرداری لەبەرکردنی قورئان بە کارپێکردنی و پەیوەست بوون بە فەرمانبەری خوا و وازهێنان لە گوناه و تاوان[1]

بەڕاستی گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە و وازهێنان لە گوناه و تاوان دڵ و دەروون ڕووناك دەكاتەوە و ئارامی و هێمنی پێدەبەخشێ و دەبێتە مایەی بەهێزی لاشە و زەین سافی و بیرتیژی و هەردەم لە ئامادەباشی بۆ کرداری لەبەرکردنی قورئان.

بەپێچەوانەوە سەرپێچی کردن و ئەنجامدانی گوناه و تاوان و فەرمانبەری نەکردنی خوای باڵادەست توانای لەبەرکردنی قورئان و فەرموودە شیرینەکەی خۆی لەلای ئەو کەسە لاواز دەکات، وەلەکۆتاییدا لەوانەیە بیگەیەنێتە ئاستێك بەیەکجاری لێی بسەنێتەوەو نیعمەتی زانستی پێ ڕەوا نەبینێ.

## بنچینەی شانزەهەم:

## پێداچوونەوە و مراجەعەی ڕێك و پێك[2]

بەڕاستی گرنگی پێداچوونەوەی بەشە لەبەرکراوەکە لە قورئان کەمتر نییە لە گرنگی کرداری لەبەرکردنەکە، وە سوود لە لەبەرکردنی قورئانەکە وەرناگیرێ ئەگەر پێداچوونەوەی لەگەڵ دا نەبێ، چونکە دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر لەبەرکردنی قورئانەکە -بەبێ مراجەعەکردن- هەمووی یان زۆربەی دوای ئەم هەموو ماندووبوونە لەبیردەبرێتەوە.



---

(1) لە ئادابەکانی هەڵگرانی قورئان بە ویستی خوا زیاتر باسی دەکەین.

(2) شێوازو چۆنیەتی پێداچوونەوە هەر لەم کتێبەدا لە بەشێکی سەربەخۆدا باس دەکەین.

### بنچینەی حەڤدەهەم:

## تێگەیشتنی هەمەلایەنە و تەواو لە ئایەتەکان یارمەتیدەرە بۆ بەتێر و تەواو لەبەرکردنی قورئان

یەکێکی تر لە بنچینەکان تێگەیشتنە لە ئایەتەکان، تێگەیشتنێکی تێروتەواوی ئەو ئایەتانەی دەتەوێ لەبەری بکەی پاڵپشت و یارمەتی‌یەکی باشن بۆ کرداری لەبەرکردنی ئایەتەکان.

تێبینی: منداڵ و غەیرە عەرەبەکان ناتوانرێ پابەند بکرێن بەم بنچینەیە، بەتایبەتی ئەوانەی زمانی عەرەبی نازانن، چونکە لەبەرکردنی ئایەتەکەو تێگەیشتن لە واتاکەی کارێکی زەحمەتە بۆ ئەوانە و تەنانەت هێندێك جاریش ئەستەمە ئەنجامدانی. ئاشکراشە مسوڵمانانی دێرین بەبێ پابەندکردنی منداڵەکانیان بە تێگەیشتن و زانینی واتای ئایەتەکان قورئانیان پێ‌لەبەر دەکردن.

### بنچینەی هەژدەهەم:

## هەبوونی هێزی پاڵنەر و ئارەزوویەکی ڕاست و دروست بۆ دەست کردن بە لەبەرکردنی قورئان پێویستە

هێزی پاڵنەر و ئارەزوو هەبوون: بارێکی ناوەوەی لەشی مرۆڤە، یان دۆخێکی مەعنەوی تایبەتە، هەڵدەستێ بە ووروژاندنی هەست و نەست و توانا لە بارودۆخێکی دیاریکراو بۆ گەیاندنی بە ئامانج و مەبەستێکی دیاری کراو. جا ئەگەر پرسیار بکەین و بڵێین: ئایا ئەو پاڵنەرانە چین کە وادەکەن مسوڵمانان ڕوو لە بەهاری قورئان بکەن و هەولبدەن بۆ لەبەرکردنی؟

دەڵێین:

## سەرەکی یەکان بۆ لەبەرکردنی قورئان

1- پێویستە تاقە مەبەستی هەموو مسوڵمانێك گەیشتن بێت بە ڕەزامەندی خواو شادبوون بە پەروەردگاری، وەلەمەزنترین هۆکارەکانیش کە مسوڵمانان دەستی پێوەبگرن و بەم مەبەستەیان بگەیەنێ گرنگیدانە بە قورئانی بەرزو پاك.

2- پاشان خوای گەورە چ پاداشت و ڕێزو حورمەتێکی بۆ بابای قورئان لەبەر داناوە، وە بۆ خوێنەرەکەی چ چاکەیەك و پلەیەکی بەرزی لەم ژیانە و دوای مردنیشی بۆ ئامادە کردووە.

دیارە ئەمانەی باس کران بەسن پاڵنەر بن بۆ ئەوەی منداڵ و گەنج و پیرەکان تینووی فێربوون و خوێندنەوەی قورئان بن و ڕوو لە لەبەرکردنی بکەن.

جا لەسەر مامۆستاو پەروەردەکاران پێویستە هەوڵ بدەن بۆ باس کردن و چاندنی ئەو پاڵنەرانەو دیاریکردنی ئەو پاداشتانەی لە قورئان و سوننەتی سەحیحدا هاتوون دەربارەی کەسانێك کە دەیانەوێ بەهۆی فێربوون و فێرکردنی قورئان، یان خوێندنەوەی، وەیاخود لەبەرکردنی، لەخوای گەورە نزیك بکەونەوەو بەخزمەتی بگەن.

تێبینی: کاتێك پاڵنەر و ئارەزوو و هەستەکان لە ناخدا دروست دەبن کە ئیمان پێش قورئان لە بیروهۆش و دڵ و دەروونندا ڕوابێ و ڕەگی داکوتابێ. ئەم بابەتەشمان بەتێرو تەسەلی لەبەرگی یەکەم دا باس کرد.

## بنچینەی نۆزدەهەم و کۆتایی:

## هانا بردن و ڕووکردنە خوا بە پاڕانەوە و نوزانەوە و لاڵانەوە و داوای یارمەتی لەو کردن بۆ ئاسان کردنی کرداری لەبەرکردن

ئەو بنچینەو یاسایانەی لە ڕابردوو باس کران لەوانەیە زۆربەیان لە بەجێگەیانـدن و پـەیڕەوکردنی کـرداری لەبـەرکردنی قوڕئـان مـاددی و نامەعنەوی بووبن، بەڵام ئەمەیان زیاتر لایەنی ڕۆحی تێدا دەبینرێ.

جا هانابردنە بەر خوا و پەنا بۆ بردنی ئاسانەکان ئاسانتر دەکاو هـەموو کۆسـپ و تەگـەرەو زەحمەتی‌یـەکان لەبـەردەم کارەکـان لـە ڕەگ و ڕیـشە دەردەهێنێ‌و لادەبات. کەسێکیش بیەوێ قوڕئانی مەزن لەبەربکات– لەبەر گرنگی و گەورەیی‌یەکەی– شەیتان و شەیتان دۆستان بۆ دژایەتی‌کردنی دێنە مەیدان و چەندان کۆسپ و نەخۆشی‌و ناخۆشی دێننە ڕێ و ناهێڵن کارەکـە وابەئاسـانی ئـەنجام بـدرێت. بۆیـە لـەکاتی دروسـتبوونی هـەر حاڵـەتێکی ئـاواو بێزارکـەر، یـان هـەر پـێش دەسـت کـردن بـە کـرداری لەبـەرکردن بـە دوعـا و پاڕانـەوەو گریـان ڕوو بکرێتـە خـوای نـزا وەرگـرو وەڵامدەر بۆ کار ئاسان کردن و زوو بە هیوا و ئاوات گەیاندن.

خوای و پەروەردگارو سەرخەری بڕواداران بـەلوتف و بـەزەییت داوات لێ دەکـەین لـە نزیـك بوونـەوەمان لەفـەرمووده بەرزەکـەی خـۆت یارمـەتیمان بدەیت و پشتیوانیمان لێ بکەیت.آمین.

ئەوانەی خاوەن شەهادەن لە دەرچوانی زانکۆ و
پەیمانگاکان بەتایبەتی پزیشکێ و ئەندازیاران ئەوا لە
ڕووی زەکاوەتەوە بە کەسانی زیرەکێ و خاوەن توانا و
هێندێکیان بەهرەدار دەژمێررێن، بۆیە دەبێ لەو
کەسانە بن کە هەموو قورئان یان بەلایەنی کەمەوە
چەند جوزئێکیان لە قورئان لەبەرە

بەشی سێ یەم

# ڕێگاکانی لەبەرکردنی قورئانی مەزن

لەم بەشەدا نۆ(9) ڕێگا باس دەکەین بۆ جێبەجێ کردنیان لە کرداری لەبەرکردنی قورئانی مەزن. جا لە جێ بە جێ کردنیان ئەگەر هەندێکیان بەیەکەوەش بن ئاسایییەو دەگونجێ .بە واتایەکی تر: ئەو کەسە دەتوانێ چەند ڕێگایەك لە یەك کاتدا بەیەکەوە لە کرداری لەبەرکردن کۆ بکاتەوەو پەیڕەو بکات.

**ڕێگای یەکەم:**

**لەبەرکردنی قورئانی مەزن لە ڕێگەی مزگەوت و سەنتەرەکانی فێرکردن و لەبەرکردنی قورئان**

لە کوردستانی خۆشەویستمان چەندان سەنتەری فێرکردن و لەبەرکردنی قورئانی بەرز هەن، ئەو سەنتەرانە کەسانی خواناس[1] و پسپۆڕ مشوریان دەگێرن و بەڕێوەیان دەبەن، وەهەریەك لەم سەنتەرانە بۆ فێرکردن و لەبەرکردنی قورئانی بەڕێز شێوازو ڕێگای تایبەتی خۆیان هەیە، بۆیە ئێمە بە پێویستی نازانین باس لەچۆنیەتی کارکردنیان بکەین، بەڵکو تەنها ئەوە دەڵێین: هەرکەسێك دەیەوێ بەڕێكوپێكی قورئان فێربێ و بەردەوام بێ تا لەبەری دەکات با پەیوەندی بەم سەنتەرانەوە بکات.

وەهەروەها هێندێك لە مزگەوتەکان مامۆستایانی بەقەدر سالآنە خولی فێرکردن و لەبەرکردنی قورئانی پایەدار دەکەنەوەو مسوڵمانان بەشداری تێدا دەکەن و سوودێکی زۆر دەبینن.

---

(1) أحسبهم... والله حسيبهم ولا أزكي على الله أحدا.

ڕێگای دووەم:

## لەبەرکردنی قورئانی مەزن لە نێوان دوو کەس

### بۆ پەیڕەوکردنی ئەم ڕێگایە ئەم خاڵانەی خوارەوە هەنگاو بنێ:

**هەنگاوی یەکەم:** یەکێك هەڵبژێرە لەو هاوڕێیە باشانەی کە وەکو تۆ بۆ لەبەرکردنی قورئانی مەزن تامەزرۆ و بە پەرۆشە، وە با لە نێوانتاندا مەوعیدێکی گونجاو بۆ بەیەك گەیشتنتان هەبێت، وە وا چاکە ئەو مەوعیدە ڕۆژانە بێت، ئەگەر نەگونجا با هەفتانە بێت.

**هەنگاوی دووەم:** لەسەر لەبەرکردنی سورەتێك ڕێك بکەون.

**هەنگاوی سێیەم:** با هەر یەکەتان قورئانەکەی بەردەستی بکاتەوە و یەکێکتان ئایەتی یەکەم لەسەر قورئانەکە بە تەماشاکردن بخوێنێ و ئەوەی دووەمیان لەسەر قورئانەکەی خۆی گوێی بۆ بگرێ، ئینجا دوای تەواوبوونی کەسی یەکەم لەئایەتی یەکەم با کەسی دووەمیش لەسەر قورئانەکە ئایەتی یەکەم بخوێنێتەوە، ئینجا با کەسی یەکەم ئایەتی یەکەم لەبەر بخوێنێتەوە، وە کەسی دووەمیش بەهەمان شێوە، وە هەروەها.

**هەنگاوی چوارەم:** وەرنە سەر ئایەتی دووەم، وە بەهەمان شێواز تا دەگەنە کۆتایی لاپەڕەکە.

*هەردوو هەنگاوی سێیەم و چوارەم دەکرێ بە شێوازێکی تر ئەنجام بدرێن، بەوەی هەرکەسە و لەلای خۆی لەماڵەوە یان هەر شوێنێکی تر پشکی دیاریکراوی خۆی لەبەربکا و پاشان لە کات و شوێنی دیاریکراو بۆ یەکتری بخوێننەوە.

**هەنگاوی پێنجەم:** ئینجا کرداری تاقیکردنەوە دێتە پێش، وە با یەکێکتان مامۆستا و ئەویتریش قوتابی بێت، وە بە پێچەوانەوە، واتە: هەر جارە و یەکێکتان لەویتر بپرسێتەوە. ئەمەش لەناو پێشینانداا هەبووە و پێی گوتراوە موداڕەسە (مدارسة).

**هەنگاوی شەشەم:** ئینجا با هەریەکەتان ژمارەی هەڵەی بەرامبەری تۆمار بکاو پاشان لە هەڵەکانی ئاگاداری بکاتەوە تاکو برادەرەکەی پێی بزانیٚ‌و جارێکی تر تێی نەکەوێت، کورد گوتەنی: (لە هەر کەوتنێك پەندێك)، یان (هەر عەقڵێك لە خەسارەیەك).

**ڕێگای سێیەم:**

## گوێ گرتن لە تۆمارکەر (مسجل)

بۆ سوود وەرگرتن لەئامێری تۆمارکەر چەند شێوەیەکی هەیە، کە ئەمانەی خوارەوە هێندێکیانن:

**جۆرو شێوەی یەکەم:**

1. خەتمێکی تەواوی قورئانی مەزنی تۆمارکراو بە دەنگی قورئانخوێنێکی خۆش بکڕە، وەکو حوصەری، مەنشاوی، شوڕەیم، محمد ئەیوب ... هتد.
2. کاسێتی یەکەم لەگەڵ خۆت ببە ناو ئۆتۆمبێل[1]. لای یەکەم گوێ بگرە تا کۆتایی هاتنی.

---

(1) بەڵام ئەوانەی سەیارەیان نیە دەکرێ شێوازەکانی تر جێبەجێ بکەن، وە دەتوانن لە سەردان و سەفەردا کاسێتێکی قورئان لەگەڵ خۆیان هەلگرن و لە کاتی سواربوونی تەکسی دا بە تەسجیلەکەی ناوی لێیبدەن، تا بەردەوام لە خێر و پاداشتی قورئان بێبەش نەبن. وە ئەگەر تەسجیلی تەکسیەکە شتێکی خراپیشی لەسەر بێ، تۆ دەتوانی بەهۆی قورئانەکەوە ئەم خراپەیە بگۆڕی ، وەیان بەکارهێنانی فلاش میمۆریو مۆبایل لە هەر بارو حالەتێکی تر

3. لای یەکەم دیسانەکە دووبارە بکەوە.

4. بۆ جاری سێیەمیش سێ بارەی بکەوە و گوێی لێبگرە، وە ئەمجارە هەوڵ بدە لەگەڵیدا ئایەتەکان دووبارە بکەیتەوە، وە دەست پێبکە لەو شوێن و جێگایەی ئەو دەست پێدەکات، وە ڕاوەستە لەو شوێن و جێگایەی ئەو ڕادەوەستێ.

5. لە گوێ گرتنی جاری چوارەمدا، ئەگەر دەستی پێکرد تۆش لەگەڵی دەست پێبکە، جا ئەگەر ئایەتەکە کۆتایی هات یەکسەر تەسجیلەکە ڕاگرە و بۆ خۆت ئایەتەکە لەبەر دووبارە بکەوە. ئەگەر هەڵەت کرد هەوڵ بدە جارێکی تر دووبارەی بکەیتەوە، وەئەگەر بەڕاستی خوێندتەوە ئەوا زیاتر لە سێ(3) جار بە لەبەر بڵێوە تاکو بە ئیزنی خوا باش لەبیروهۆشت دابمەزرێ.

6. پاشان دەست بکە بە لەبەرکردنی ئایەتێکی تر، بە جێبەجێ کردنی هەمان هەنگاوەکانی پێشوو.

7–نەکەی کرداری بەستنەوەی ئایەتەکان بە یەکتری لەبیر بکەی.

ئەم شێوازە بۆ ناو ئۆتۆمبێل وماڵەوە دەست دەدات. بەڵام ئەگەر ویستت لە ماڵەوە قورئان لەبەربکەی دەبێ ڕەچاوی ئەم تێبینیانەی خوارەوە بکەی:

تێبینی یەکەم: گوێ لە سورەتەکە بگرە لەو کاتەی کە تۆ سەیری قورئانەکەی بەردەستت دەکەی، وە ڕەچاوی شوێنی وەستان و دەست پێکردن بە ووردی بکە.

تێبینی دووەم: سورەتەکە بەپێی بەسەرهاتو واتاکانی بکە بە چەند برگەیەک بەمەرجێک هەر برگەیەک لە پێنج ئایەت زیاتر نەبێت.

**تێبینی سێیەم:** لە کاسێتەکە گوێ لە بڕگەی یەکەم بگرە، ئینجا بە لەبەر دووبارە و سێ بارەی بکەوە، جا ئەگەر بینیت بڕگەکە گەورەیە و لەبەرکردنی زەحمەتە، ئەوا بیکە بە دوو بەش و نیوەی هەڵگرە بۆ جارێکی تر.

**تێبینی چوارەم:** تەسجیل بەکارهێنان بە زۆری بۆ نابیناکان بە کەڵکە، هەرچەندە خەڵکانی تریش بەم ڕێگەیە قورئانی مەزنیان لەبەر کردووە.

**جۆرو شێوەی دووەم: بەگەڕخستن و بەکارهێنانی عەقل و ژیری ناوەوە:**

ئەم شێوازە لەگەڵ هەبوونی هەندێك جیاوازی، بە جۆر و شێوەی یەکەم دەچێت، وە بۆ جێبەجێ کردنی ئەم شێوازە دەتوانین ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێین:

1- کاسێتێکی قورئان بە دەنگی قورئان خوێنێکی ڕێك و ڕەوان و خۆش بۆ ئەو سورەتە هەڵبژێرە کە دەتەوێ لەبەری بکەی.

2- بەر لە نووستن[1] لەو کاتەی چراکان کوژاونەتەوەو دونیا خامۆشەو سەرت بە سەرینەکەوە کردووە تەسجیلەکە پێ بکەو گوێی لێبگرە.

3- بەهەموو هەست و نەست و گیانتەوە گوێ لە قورئانەکە بگرە.

4- تا دەکرێ دەنگی قورئان خوێنەکە نزمو نەرم بێ.

5- لەدوای نوێژی بەیانی هەوڵ بدە ئەو سورەتەی بەر لە نووستن بیستبووت چەند جارێك بیخوێنیتەوە، لە دوایدا دەبینی بە خێراییەکی زۆر سەیر دێتە بەرت، ئەمە تاقی بکەوە، چونکە تاقی کردنەوە باشترین بەڵگەیە.

---

(1) بەڵام ئەوانەی هاوسەریان هەیە لەبەر بار و پەیوەندی هاوسەرایەتیان و ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم- لەم بارەیەوە: (وإن لزوجك عليك حقا) بە پەسەندی نازانم ئەم شێوازە بە بەردەوامی هەموو شەوێك بەر لە نوستن ئەنجام بدرێ.

**سوود و کەڵکەکانی جێ بەجێ کردنی شێوازی دووەم:**

1- عەقڵ و ژیری ناوەوە بەردەوام کاردەکات، بەتایبەتی شەوان بەر لە نووستن جا چ بە چاك بێ یان بە خراپ ، ئەمەش لە زۆربواردا خۆی دەبینێتەوە، وەکو ئەو کێشە و ڕووداوانەی مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەیانبینێ، شەوان بە ماوەیەك بەر لە نووستن بە چەندان خەیاڵ دەێتەوە یادی، وەیان هەر بیستن و بینین و خوێندنەوەیەك بەر لە نووستن ئەنجامی بدات، ئەوا بیروهۆش تۆماری دەکات و دوای نووستن ژیری ناوەوە هەڵدەستێ بەشیکردنەوەی و پاشان دامەزراندن و ڕاگیرکردنی، بۆیە بەیانیان کاتێك لە خەو هەڵدەستی بەبێ ویست و دەسەڵاتی خۆت ئەوەی شەو ئەنجامت دابوو یەکسەر دێتەوە یادت و بەئاسانی بەسەر زمانت دادێت.

جا ئەگەر سورەتێك لە قورئانی پایەدار بەر لە نووستن بەهۆی ئامێری تۆمارکەر یان هەر ڕێگایەکی تر گوێی لێبگری و بیخوێنیتەوە ئەوا بەیانی کاتێك لەخەو هەڵدەستی هەست دەکەی زمانت بەهەمان دەنگ و ئاوازە بیستراوەکەی شەو دەجووڵێ و قسە دەکات.

ئینجا لێرەوە دەرك بە نهێنی دەست بەسەرداگرتنی دەزگای ڕاگەیاندنی ئوممەتەکەمان لە لایەن خراپەکارانەوە دەکەین لە پەخش و پێشکەش کردنی بەرنامەی شەوان لە گۆرانی و فیلمی خراپ لە تەلەفزیۆن و سەتەلایتەکان کە چەند لە پیلان و فرۆفێڵدان بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و ڕەوشتی پاك.

بەڵێ، زانیمان و بۆمان دەرکەوت کە دەیانەوێ نەوەو وەچەکانمان تا درەنگی شەو سەیری کەناڵ و پەخشە خراپەکانیان بکەن، بۆ ئەوەی بەیانی کە هەڵدەستن هەمان وێنە و دیاردە دزێوەکانی شەویان بێتەوە

یادو لاسایی بکەنەوە و لە ناو کۆمەڵگا بڵاوی بکەنەوە و جێبەجێی بکەن.

ئامان سەد ئامان ئەی مسوڵمانان! نەکەن نە بە شەو نە بە ڕۆژ تاوێکیش بە دیار ئەم جۆرە بابەتانەوە دابنیشن، وە ئەگەر تا ئێستاش دانیشتوون ئەوا تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە لای خوای لێخۆشبوو و بەبەزەیی تا لەم دونیایە لە تام و چێژ و شیرینی ئیمان و لەبەرکردنی قورئان بێبەشمان نەکا و لەو دونیاش بە دیدار و بینینی خۆی شادمان بکا و بمانکاتە دراوسێی خۆشەویستەکەی صلی الله علیه وسلم.

2- ئەم شێوازە سوود و کەڵکێکی زۆرت پێدەگەیەنێ بۆ پێداچوونەوە و مراجعەی قورئان.

3- ئەم شێوازە چارەسەرە بۆ چەندان گرفت و نەخۆشی و ناخۆشی، وەکو: خەمۆکی، پەستی و تووڕەیی، دڵتەنگی، غەم و خەفەت، خەوزڕان و بێخەوی و درەنگ نووستن، خەونی ناخۆش و بێسەروبەر، پەرکەم و بەرکەوتنی جنۆکە.

4- وە بۆ چاك لەبەرکردنی نابیناکان و پێداچوونەوەی قورئان یارمەتیدەرێکی زۆر باشە.

**جۆرو شێوەی سێیەم: ئەم هەنگاوانە بنێ:**

**هەنگاوی یەکەم:** لە خەتمەکەتدا کاسێتی ئەو سورەتە دیاری بکە کە دەتەوێ لەبەری بکەی.

**هەنگاوی دووەم:** بە بەردەوامی تا یەك هەفتە گوێ لەم کاسێتە بگرە، هەر کاتێك کاسێتەکە تەواو بوو دووبارەی بکەوە، وەئەگەر لەناو ئۆتۆمبێلەکەت یان لە میانەی کارکردنت بوو ئاساییە.

**هەنگاوی سێیەم:** لە کۆتایی هەفتەدا لە کات و شوێنێکی گونجاو دانیشە، وەتا دەتوانی هەوڵ بدە ئەوەندەی بە درێژایی ئەم هەفتەیە گوێت بۆ گرتبوو لەبەری بکەیت.

**هەنگاوی چوارەم:** تۆ تەنها کەمێك دیقەت و ووردبوونەوەت لەسەرە ئەگەرنا لە پڕێکەوە دەبینی بە ئاسانی سوورەتەکەت بە شێوەیەکی باش لەبەرکردووە، وە ئەم لەبەرکردنەش بە پێداچوونەوە و زۆر دووبارەکردنەوە ڕاگیر و دامەزراو دەبێت.

**هەنگاوی پێنجەم:** وەهەروەها بۆ هەفتەکانی تریش دەتوانی هەمان هەنگاوەکانی ڕابردوو بەکاربهێنی، وەئەگەر ناوە ناوە پشوو بە بیروهۆش و مێشکت بدەی ئەوە چاکترە، واتە لە هەر چوار پێنج هەفتە با هەفتەیەك پشووبێ.

**ڕێگای چوارەم:**

**لەبەرکردنی قورئان بەڕێگەی نووسین**

پەنجەرەی بیروهۆش لەلای خەڵکان جیاوازە و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ، هەیانە بیروهۆشیان زۆر بەهێزە و ڕوانین و دیتن بەسە بۆیان، واتە بە بینین و خوێندنەوەی ئایەتێك ئایەتەکەی لەبەر کردووە، وە هەیانە بیروهۆشی لە ڕێی بیستنەوە زۆر بەهێزە، دەتوانێ دوای تێپەڕبوونی بیست (20)ساڵ پێت بڵێ: ئاوا و ئاوام لەفڵان و فیسار کەس بیستووە، ئیدی دەقاودەق بۆتی بگێڕێتەوە.

**خوێنەرانی بەڕێز:**

دوای ئەم ڕێ خۆشکردنە دەڵێم: بەڕاستی ڕێگای نووسینەوە سەبارەت بە کرداری لەبەرکردن ڕێگایەکی جوان و باشە. بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ

ڕوانین و بیستن یار و هاودەم بکرێ.

ئینجا وەرە پێنج ئایەت یان زیاتر لەبەر بکەو بە ووردی سەرنجیان بدەو بۆیان بڕوانە، لە پاشان ئەوەی لەبەرت کردووە بە لەبەر لەسەر کاغەزێك بینوسەوە، لە دوایدا سەیری نووسینەوەکەی خۆت و قورئانەکەی بەردەستت بکە بۆ ئەوەی ئەگەر هەڵەت کردبێ بە هەڵەکانی خۆت بزانی. وەهەروەها ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەوەی زۆر هەوڵ دەدەن بەڵام باش بۆیان لەبەرناکرێ ئەوا دەتوانن ئەو پشك و بەشەی دەیانەوێ لەبەری بکەن باچەند جارێك بینوسنەوە کە لە سێ(3) جار کەمتر نەبێ، پاشان هەوڵ بدەن لەبەری بکەن ئیدی هەست دەکەن بۆیان ئاسانتر بوە. خوای گەورە بە واسیعی و فراوانی خۆی بۆ هەموو لایەکمان ئاسانتر بکات.

**ڕێگای پێنجەم:**

## لەبەرکردنی قورئان بە ڕێگەی پێشبڕکێ و خەڵات و پاداشت پێدان

پێشبڕکێیەکان و بزواندنی هەست و نەستی بەرامبەر و پێدانی خەڵات چەندان وێنەو شێوەی هەن، کە ئەمانەی خوارەوە هێندێکیانن:

**شێوازی یەکەم: هاورێیەکان لەگەڵ یەکتری:**

دەتوانین بۆ جێبەجێ کردنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێین:

**هەنگاوی یەکەم:** لەگەڵ چەند هاورێیەکت لە ئیش کردن، یا لە قوتابخانە، یان لە نوسینگە. ڕێك بکەون لەسەر لەبەرکردنی سورەتێك لە میانەی چەند ڕۆژێکی کەم. تا بەدیار بکەوێ کێ دەبێتە دەرچووی یەکەم.

**هەنگاوی دووەم:** دوای تێپەڕبوونی ماوەکە لە نوێژگای قوتابخانە. یان لە شوێنی ئیش کردن کۆببنەوە. ئەگەر ئەمە نەڕەخسا. بە یەکدەنگی شوێنێکی تر دیاری بکەن.

**هەنگاوی سێیەم:** یەکێکتان هەڵبستێ بە تاقیکردنەوەی هاوەڵەکانی، وە با پرسیاریان ئاراستە بکاو پلەکانیشیان تۆمار بکات، وە بە پێچەوانەوە.

**هەنگاوی چوارەم:** تەماشا دەکرێ کامەیان هەڵەی نەبوو، یان لە هەموویان هەڵەی کەمتربوو، دەبێتە دەرچووی یەکەم.

**هەنگاوی پێنجەم:** دەکرێ هەر جارە و یەکێکتان هێندێك لە دارایییەکەی خۆی تەرخان بکاو ببەخشێ بۆ کڕینی دیارییەکی سوودبەخش، وەکو: کتێبێکی بەنرخ، یا خەتمێکی تەواوی قورئانی مەزن، یاخود هاوشێوەی ئەمانە بۆ ئەو کەسەی بە یەکەم دەرچووە.

**شێوازی دووەم: مامۆستا لەگەڵ قوتابییەکانی:**

مامۆستا لە قوتابخانە هەڵبستێ بە گێڕانەوەو باس کردنی هێندێك لە فەرمایشتە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە فەزڵو گەورەیی قورئانو لەبەرکردنی، وەبە گێڕانەوەی هێندێك ڕووداو و بەسەرهات دەربارەی قورئان لەبەرەکان، ئینجا دوای ئەوەی بەم شێوەیە دڵو دەروونی ساز و ئامادە کردنو هەستی بزواندن پێیان بڵێ: بەیانی هەموومان – إنشاء الله – کە هاتین فڵانە سورەتمان لەبەر کردووە، وەهەر کەسێك بەڕێكو ڕەوانیو بەبێ هەڵە لەبەر بکات ئەوا ناوەکەی لە قوتابخانە لە تەختەی ڕێزو سەربەرزی هەڵدەواسینو خەڵاتی پێشکەش دەکەین.

**شێوازی سێیەم:** ڕاگەیاندنێکی گشتی لە بەندیخانە و گرتووخانەکان ڕابگەیەنرێ، بەوەی کە هەر کەسێك قورئانی مەزن لەبەر بکات ئازاد دەکرێ، یان هەرچ نەبێ سزاکەی سووك دەکرێ و ماوەی بەندییەکەی کەم دەکرێتەوە.

**شێوازی چوارەم: باوك لەگەڵ منداڵەکانی:**

باوك بە زۆر ڕێگە و شێواز دەتوانێ قورئانی مەزن لای منداڵەکانی خۆشەویست بکات:

بۆ نمونە: باوك هەر دەبێ کەل‌وپەل و شتومەکی پێویست بۆ منداڵەکانی بکڕێت، بەلام دەتوانێ ئەو شتومەکانە وەکو هاندەرێك بۆ کرداری لەبەرکردنی قورئان بەکاربهێنێ‌و بە منداڵەکانی بڵێ: ئەگەر ئەو سورەتە و ئەو سورەتەتان لەبەرکرد ئەوا جل‌وبەرگێکی جوان و قەشەنگتان بۆ دەکڕم، یان بە منداڵە بچووکەکەی بڵێ: ئەگەر ئەم سێ(3) مانگەی پشووی هاوین جزمی(عم)ت لەبەر کرد و ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ و کۆڕی لەبەرکردن بووی لە مزگەوت ئەوا پایسکلێکت بۆ دەکڕم.

وەهەروەها پێیان بڵێ: ها چی دەڵێن: ئەگەر لە ماوەی ئەم هەفتەیە یان ئەم مانگەدا فلأن سورەتتان لەبەر کرد بۆ گەشتێك بتانبەم و خواردنێکی بەتام‌و خۆش‌و بەلەزەتتان بۆ ئامادە بکەین؟

**شێوازی پێنجەم: مامۆستای مزگەوت لەگەڵ فەقێ‌و قوتابییەکانی:**

بەم شێوازانەی لەمەوپێش باس کران مامۆستای مزگەوت دەتوانێ قوتابیەکانی هان بدات بۆ لەبەرکردنی کتێبی کۆتایی خوای گەورە.

**شێوازی شەشەم: پیاو لەگەڵ هاوسەرەکەی:**

بەڕاستی ئەمڕۆ خەڵکان زۆر کەمتەرخەمن لە تێگەیاندن و پەروەردەکردنی خاوخێزانیان و هیچ هەست بە لێپرسینەوەی خوای گەورە ناکەن لەو ئەرکەی خراوەتە سەرشانیان. دڵنیابن خوای گەورە ئێمەی تەنها بۆ ژیان‌و خواردن‌و نووستن‌و ڕابواردن دروست نەکردووە.

بەڵکو ئێمەی دروست کردووە تاکو باش بیپەرستین، بەڵکو پێشبڕکێ بکەین لە باش پەرستنیدا، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢١﴾﴾[1].

جا با پێشبڕکێ بکەین بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرك و کاری سەرشانمان، با پێشبڕکێ بکەین بۆ فێرکردنی خاوخێزانمان، با پێشبڕکێ بکەین بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندنی کەس‌وکارمان بە هیوای بێبەش نەبوون لە بەهەشتێکی ڕازاوەو ئاوا پان و پۆڕو پڕ لە نازو نیعمەت‌و دیتنی خوای گەورە.

**ئینجا با بێینەوە سەرو کاری قسەی یەکەممان:**

پیاو لە زۆر بوار و مەودادا دەتوانێ هەست‌و نەستی خێزانەکەی بروژێنێ، لەوانە:

* کاتێك پیاو بەیانیان لەماڵەوە بەرەو کار دەیەوێ بەڕێ بکەوێ دەتوانێ داوا لە خێزانەکەی بکا بە لەبەرکردنی فلاَنە سورەت تا ئەو لە کار دەگەڕێتەوە، ئینجا بەڵێنی پێبدا ئەگەر وای کرد ئەوا خەلاَت و دیاری‌یەکی بە نرخ‌و نایابی بۆ دەکڕێ و لەگەڵ خۆی بۆی دێنێتەوە.

* وە هەروەها دیاری‌و هەدیەی سەفەرو گەشتیش کاتێك پیاو سەفەر دەکاو دێتەوە خۆ هەر دەبێ هەبێ، وە بێگومان کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دڵ‌و دەروونی هاوسەرەکەت دەبێ، وەدەرفەتێکی چاکیشە بۆت ئەی پیاوی بەڕێز، نەکەی لەبیری بکەی و لە کیسە خۆتی بدەی، جا پێش بەڕێکەوتن بۆ گەشتەکە لەگەڵ هاوسەرەکەت هاودەنگ بن لەسەر



---

(1) سورة الحديد (21).

لەبەرکردنی سورەتێك، وە لە گەڕانەوەشدا پێی ڕابگەیەنە کە ئەم دیاری‌یە بەبۆنەی لەبەرکردنی سورەتەکەیە.

* وەئەو ئافرەتە هۆشیارەی کە قورئانی مەزنی لەلا گرنگە و بە هەند تەماشای دەکات، دەتوانێ لە جیاتی هاوسەرەکەی هەستێ بە هاندانی منداڵەکانیان، وە چاودێری کردنیان لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن.

وەبزانە ئەی خوشکی بەڕێز! کاریگەری تۆ لەسەر منداڵەکانت گەورەیە، وەلەوانەیە گەورەتر بێت لەهی پیاوەکەت، چونکە تۆ ڕاستەوخۆ لە پەروەردە و چاودێریکردنی منداڵەکان دایت و زیاتر لە باوکیان ئاگات لێیانە، وە کەسایەتی و جموجوڵ و چالاکی هەریەکەیان زۆر بەچاکی شارەزا و ئاگاداری، وە دەزانی چیان پێخۆشەو ڕقیان لە چی‌یە، بۆیە ڕۆڵی تۆ زۆر بەرز و مەزنە و نەکەی ئەو پاداشتە زۆرەی بۆ فێرکردنی قورئانی مەزن دانراوە لە کیس خۆتی بدەی و منداڵەکانت لێی بێبەش بکەی.

## ڕێگای شەشەم

### بەستنەوەی کرداری لەبەرکردن بە ڕووداوی گرنگ و کاریگەر

بێگومان چەندان ڕووداو و بەسەرهاتی سەیر و سەرسوڕهێنەر و کاریگەر بەژیانی مرۆڤ تێپەڕدەبن و زۆربەیان لەبیر دەکرێن.

بەڵام هێندێکیان لە بیروهۆشدا دەمێننەوەو نیگار دەکرێن، بە جۆرێك ئەگەر ئەو مرۆڤە هەرچەندە بەساڵدا بچێت و تەمەنی درێژ بێت ئەستەمە لەبیرکردنیان، جا ئەو ڕووداوانە دەروونی و مەعنەوی بن یان جەستەیی و لاشەیی.

وەئەگـەر مرۆڤـ لەبـەرکردنی قورئـان ببەسـتێتەوە بـە ڕووداوێـك ئـەوا بەڕاستی لەبەرکراوەکەی باشتر لەبیروهۆشدا دادەمەزرێ و ڕاگیر دەبێت، وەهـەر کاتێك ئەو مرۆڤە یادەوەری ڕووداوەکەی کرد یەکسەر لەگەڵیدا لەبەرکراوەکەی دێتەوە یاد، بۆ ئەمەش چەندان نموونە و ڕووداو هەن لە مێژووی زێڕینی ئیسلامەتی، لەوانە:

1- ڕووداوی گوشینی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەلایەن جبریلەوە سەلامی خوای لێ بێ. ئەوە بوو بۆ یەکەم جار جبریل سەلامی خوای لێ بێ لە ئەشکەوتی (حراء) بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هـاتو دوای گفتـو گـۆ و سـێجار گوشـین و سـازوئامادەکردنی دڵ و دەروونی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێنج ئایەتی سەرەتای سوڕەتی(العلق)ی لەلای خوای گەورەوە بۆ هێنا و ئەویش لەبەری کرد، بێگومان ئەو ڕووداوە لەو شوێنە دوورو چۆڵە لەلای پێغەمبەر صلی الله علیـه وسـلم زۆر سـەیرو غـەریب بـوو بـەجۆرێك هـەرگیز لـەبیری نەکاتو بە کاریگەرییەوە بیگێڕێتەوە و باسی بکات.

2- ڕووداوی بوختانەکە (حادثة الافك) کە بە عائیشەی دایکمان کرا: ئایا دەچـێتە عەقڵـەوە خـاوەنی ئـەم ڕووداوە ئـەو چـەند ئایەتـەی خـوای گەورەو ئاگادار لەم بارەیەوە دایبەزاندن لەبیری بکات؟!

3- هـەروەها دابـەزین و هاتنـەخوارەوەی ئـەو چـەند ئایەتـەی سـوڕەتی بەرائە دەربارەی ڕووداوی نەچوون و دواکەوتنی ئەو سێ (3) هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە غەزای تەبووك، ئایا لەبیری ئەو سێ هاوەڵە دەردەچن؟!

بۆیـە هێنـدێك لـەو ڕووداوانـەی دەکـرێ قورئـانی تێـدا لەبـەر بکـرێ کـە لەوانەیە گشتمان یان زۆربەمان بگرێتەوە ئەمانەن:

1. <u>گیران و بەندكردن</u>: زۆرێك لە بەندكراوەكان كە ئازاد دەكرێن دەبینی لە بەندیخانە فێری چەندان پیشەی جۆراو جۆر بوو ون، وەهێندێكان هەموو قورئانیان بەتەواوی لەبەر كردووە، بۆیە ژێر ئەو كەسەیە ئەم هەلە لە دەست خۆی نەدات.

وەدەڵێم هەر مسوڵمانێك با ئەوە لە بیری خۆی دابنێ كە هەركاتێك لەبەر هەر هۆیەك كەوتە زیندان بەرنامەی لە دووەم هەفتەی زیندانیەكەی تا ئەو كاتەی خوای گەورە ڕزگاری دەكا ئەوەبێ خەریكی لەبەركردنی قورئانی مەزن بێ تا خۆی لەم شەرەف و شكۆمەندییە پێبەش نەكات، چونكە:

أ- تۆ كاتێكی زۆرو نایابت لەدەستە و هیچ ئیش وكارێك ناكەی.

ب-تۆ لەجیاتی ئەوەی دەست لە ئەژنۆ بگری و دۆش دامێنی و خەم و خەفەت بخۆی دەست بكە بە لەبەركردنی قورئان، تاخوای بەبەزەیی و میهرەبان ئارامی و دڵنەواییت پێببەخشێ و ئازارەكانت لەسەر سووك بكات.

ج- وەئەگەر - وەكو زانای كورد سەعیدی نورسی ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێ: هاودەمت دەوێ، قورئان بەسە هاودەمت بێ.

د- ئەم دەست بەتاڵییە دەرفەتێكە لەوانەیە گەڕانەوەی نەبێ، كەواتە لە كیس خۆتی مەدە.

2. <u>نەخۆشی كاتی و هەرحاڵەتێكیتر</u>: وەكو دەست و قاچ شكان، هەڵبەتە ئەم جۆرە نەخۆشانە بۆ چارەسەر و چاكبوونەوە پێویستیان بە پشوو و حەسانەوە هەیە لەماڵەوە، كە بەهۆیەوە كاتێكی زۆریان لەبەر دەستدایە، بەڕاستی ئەمەش دەرفەتێكە بۆ لەبەركردنی قورئانی مەزن.

*ئەزموونی تایبەتی*

من بۆ خۆم لەبەر حاڵەتێك نزیکەی سێ (3) مانگی هاوین لەماڵەوە بووم، سوپاس‌و ستایش بۆ خوای میهرەبان کە لەم ماوەیەدا بە فەزڵ‌و مننەتی خۆی ئاسانکاری بۆ کردم‌و توانیم قورئانی مەزن بە تەواوی لەبەر بکەم.

3. کەسێك کوڕێکی خۆشەویستی بەهۆی گەشتکردن یان گرتن‌و بەندکردن لێ وون دەبێ، ئینجا دەست دەکات بە لەبەرکردنی سوڕەتی (یوسف) سەلامی خوای لەسەر بێت، بێگومان ئەم لەبەرکردنە زۆر پتەو‌و قایم دەبێت، چونکە واتای ئایەتەکانی سوڕەتەکە لەگەڵ واقیعی ژیانی کەسەکە یەکدەگرنەوە‌و کاردەکەنە سەری.

**ڕێگای حەوتەم**

**بەستنەوە و یار و هاودەم کردنی کرداری لەبەرکردنی ئایەت و سوڕەتەکان بە کاتێکی تایبەت**

مەبەست لە بەستنەوەی لەبەرکردنی ئایەت‌و سوڕەتەکان بە کاتێکی تایبەت‌و دیاریکراو ئەوەیە: کە کاتێك لە کاتەکان دیاری بکەی‌و چەند ئایەتێك یان چەند سوڕەتێکی تێدا لەبەر بکەی، بۆ نمونە لە شەو‌و ڕۆژی هەینی سوڕەتی کەهف، وەیان شەوانی قەدری مانگی ڕەمەزان، وەیان کاتێك لەگەڵ خێزانەکەت دەچیتە نۆرینگەی پزیشکی، یان نەخۆشخانەی لەدایك بوون، یان لەگەڵ کەسێکی نزیکت داخلی نەخۆشخانە دەبیت لەجیاتی ئەوەی دەست لەناو دەست بنێی‌و کات بەفیڕۆ بدەی، قورئانەکەی گیرفانت -کە پێویستە هەرگیز لێت دانەبڕێت- دەربهێنە‌و ئەوەندەی دەتوانی لێی لەبەربکە، جا چەند پێداچوونەوەی ئەم لەبەرکراوانە بکەیتەوە ئەوا هەمان کات‌و ڕۆژگارت دێتەوە یاد.

## ڕێگای هەشتەم

### بەستنەوە و یار و هاودەم کردنی لەبەرکردنی ئایەتو سورەتەکان بە سەردان و شوێنێکی تایبەت

مرۆڤ لە سەردان و سەفەرەکانیدا کاتی وادەبێ دەست بەتاڵ و بێ ئیش بێ، بۆیە دەتوانێ ئەم هەلە بەفیڕۆ نەداو هەوڵبدا کارێکی باشی تێدا ئەنجام بدات ، وەکو لەبەرکردنی قورئان.

*ئەزموونی تایبەتی*

لە سەردانی یەکێك لە خزمە نزیکەکانم لەکاتی هەبوونی دەرفەت بە فەزڵی خوا توانیم هەر سێ(3)سورەتی (الطور)و (النجم)و (القمر) لەبەر بکەم.

## ڕێگای نۆیەم

### لەبەرکردنی قورئانی مەزن لای کوێر و نابیناکان

دیتن بەخشش و نیعمەتێکە لە نیعمەتەکانی خوای گەورە، کەمجار هەیە نرخەکەی بزانین و سوپاسگوزاری لەسەر بکەین، وە ئەو ئەرك و کارانەی لە پەرستندا خراوەتە سەری جێبەجێی بکەین.

دە وەرە خوێنەری سەنگین چەند کاتژمێرێك بەڵکو چەند دەقیقەیەك جگە لە کاتی نووستن یان هەر ئێستا چاوت لەم نووسینەی بەردەستت، وە لەم کەل وپەل و نازو نیعمەتانەی دەوروبەرت بنوقێنە ئینجا دەزانی گرنگی و گەورەیی دیتن چەندە، وە چ بەهاو نرخێکی مەزنی هەیە.

دەزانن ئەگەر بە چاوەکانمان هەر هەموو ژیانمان لە قورئان خوێندن و خواپەرستیەکانی تر سەرف بکەین هێشتا ناتوانین چاکەی ئەم دوو چاوانە بدەینەوە چ جای نیعمەتەکانی تری خوای میهرەبان.

کەواتە: با ئەهلی قورئان و رۆڵەی ئیسلام بین و چاوەکانمان وا بۆ خوا ژێربار بکەین کە هەرگیزاو هەرگیز گوناه و تاوانی پێ نەکەین و لە سەرپێچیکردنی خودا بەکاری نەهێنین، وەهەرکاتێك گوناهمان پێ کرد تەوبە بکەین و پەشیمانی دەربرین و لۆمەی خۆمان بکەین.

بۆیە ئەو مسوڵمانانەی لە نیعمەتی بینین بێبەشن پێیان دەڵێین:

1- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مژدەتان دەداتێ کە ئەگەر ئارام بگرن بەهەشتتان مسۆگەرە:

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: خوای گەورە دەفەرموێ "من أذهبت حبيبتيه فصبر واحتسب لم أرض له ثواباً دون الجنة"[1].

واتە: "هەر کەسێك دوو خۆشەویستەکەی ببەم و لێی بستێنم ئەویش ئارام بگرێ و چاوەڕێی پاداشت بێ ئەوا بۆی بە هیچ پاداشتێك ڕازی نابم جگە لە بەهەشت".

2- لەجیاتی هێزی بینین هێز و ووزەی بینایی دڵ و چەند توانایەکی دی تایبەتی دەروونی و لاشەیی بۆ قەرەبوو کردوونەتەوە، بۆیە دەبینین زۆربەیان بیر تیژن لە لەبەرکردندا و بە چەندان جار خێراترن لە خەزن کردنی زانیارییەکان لە کەسانی ساغ.

3- هێندێك لە مسوڵمانە چاوساغەکان چاوەکانیان ناپارێزن لە گوناه و تاوان، بەڵام نابیناکان سەرەڕای ئەوەی پاداشت لەسەر لە دەستچوونی چاوەکانیان وەردەگرن ئەگەر ئارام بگرن، لەسەر ئەم نیعمەتە لێپێچینەوەیان لەگەڵ ناکرێ کە بۆچی بێفەرمانی خوایان پێ کردووە، وەیان بە پێی پێویست لە خواپەرستیدا بەکاریان نەهێناوە.

(1) رواه أحمد (7280)، والترمذي باب ما جاء في ذهاب البصر (2325).

## ڕێگاکانی لەبەرکردنی قورئانی [redacted]

وەبۆ لەبەرکردنی قورئانی مەزن لای ئەو جۆرە کەسانە چەندان ڕێگا هەن، لەوانە:

أ- بە یارمەتی مامۆستایەکی قورئان لەبەر:

لەمەدا کوێرەکان مامۆستای نابینا بۆ خۆیان بە چاکتر دەزانن نەوەکو ساغ، چونکە مامۆستای نابینای قورئان لەبەر خاوەن ئەزموونە و بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتووە، وە دەزانێ کۆسپ و تەگەرەکانی ڕێگەی لەبەرکردنی قورئان لای نابیناکان چین، وە چۆن چارەسەر دەکرێن.

ب- بەیارمەتی ئامێری تۆمارکەر(تسجیل):

تۆمارکەر ئامێرێکی دوو سەرەی سەردەمە، واتە ئەگەر لە دەست مرۆڤێکی خاوەن خووڕەوشتی چاك بێ بێگومان لە چاکەدا بەکاری دێنێ، وە ئەگەر نا بە پێچەوانەوە. بۆیە نابیناکان لە کرداری لەبەرکردنی قورئانی مەزن زۆر سوودی لێ دەبینن، وە چۆنیەتی جێبەجێ کردنی ئەم شێوازە لە ڕێگای سێیەم بە تێرو تەسەلی باسی لێ کراوە.

*ئەزموونی تایبەتی*

برایەکی نابینای قورئان لەبەر بە ناوی کاك هێمن لەگەڵ هاوەڵێکیدا بەناوی کاك عەلی سەردانیان کردم، منیش دوای ڕێز و بەخێرهێنان چەند پرسیارێکم دەربارەی لەبەرکردنی قورئان و سەرەتای دەست پێکردنی و چۆنیەتی پێداچوونەوەی ئاراستەی کاك هێمن کرد.

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: (من ئەو کاتەی ویستم دەست بکەم بە لەبەرکردنی قورئان نابینا بووم. ئیدی خوای گەورە یارمەتی دام و ئاسانکاری بۆ کردم و توانیم لەماوەی سێ (3) ساڵ قورئان لەبەر بکەم.

وەئێستا سوپاس بۆ خوای گەورە ڕۆژانە سێ (3) جزمی لێ مراجەعە دەکەمەوە، وە جاری وا هەیە هی (سبەی)و (دوو سبە)ش، واتە نۆ (9) جزم، وە هەر دەرفەتێکم بۆ بڕەخسێ پێداچوونەوەی قورئان دەکەم و دەم و زمانم دەجووڵێ.

بۆیە هەر کاتێك ئێمە لە مەجلیسەکە بێ دەنگ بووباین ئەو زمانی دەجوولا.

جا ئەگەر کەسێك بینینی نەبێ و بەم شێوەیە بێت، توخوا بۆ ئێمەی چاوساغ شورەیی نییە لە لەبەرکردن و زۆر خوێندنەوەی قورئانی مەزن غافڵ و بێ ئاگابین؟!!!

بۆیە بانگەوازێك دەکەم و دەڵێم: چاوساغەکان لە کوێن؟! خەڵکانێك بەچاوی کوێر و نەبوونی یەکێك لە نیعمەتەکان ئامادەی لەبەرکردنی قورئانن، ئەی تۆ! بە چاوی ساغ و هەبوونی نیعمەتێکی زیاتر خۆت ئامادە ناکەی و بەڕەی تەمبەڵی لەسەر خۆت لانادەی، یان تا سەر نەدەیت لە بەردی ئەلئەحەد نالێی (اللّە صدق)و لەخەوی غەفڵەت بە ئاگا نایێیت و خۆزگە بە گەڕانەوە ناخوازی؟!

بۆیە با هەوڵ بدەین نەهێڵین قورئانەکەی ماڵەوەمان تۆزی لەسەر بنیشێ و تەنها لە ڕەمەزانان بیخوێنینەوە.

# بەشی چوارەم

## هەنگاوە سەرەکی یەکان بۆ لەبەرکردنی قورئان

ئەوەی دەیەوێ قورئانی مەزن لەبەربکات دەبێ چەند هەنگاوێك بنێ تاوەکو بنچینەکانی بینای لەبەرکردنی قورئانی لەسەر ڕاگیر بکا، وە ئەم هەنگاوانەش هەر چەند قایم و توند و تۆڵتر بن ئەوا لەبەرکردنەکەی خێراتر و گەیشتن بە ئامانجەکەی نزیکتر دەبێ. ئەم هەنگاوانەش بریتین لە هەنگاوەکانی سەرکەوتن کە دەبێ لە هەموو کاروبارێکدا هەبن ئەگەرنا سەرەنجام شکستو سەرنەکەوتنو بەجێمانو وورە بەردانە، هەنگاوەکانیش بەکورتی ئەمانەن:

هەنگاوی یەکەم: شەیدا و ئارەزوومەندی (هەبوونی پاڵنەری خۆیی).

هەنگاوی دووەم: پشت بە خوا بەستن و پاشان متمانە بەخۆ بوون.

هەنگاوی سێیەم: ئامانجت دیاری بکە!

هەنگاوی چوارەم: سوودو قازانجت لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن دیاری بکە.

هەنگاوی پێنجەم: دەست بکە بە کێشانی نەخشەیەك و دانانی بەرنامەیەك بۆ لەبەرکردنی قورئانی پایەدار.

هەنگاوی شەشەم: وا بێنە پێش چاو و خەیاڵت کە تۆ گەیشتی بە ئامانجەکەت و یەکێکی لەوانەی قورئانیان لەبەرە.

هەنگاوی حەوتەم: گەیشتن بە لەبەرکردنی قورئان بە هیمەت و وورە بەرزی پاڵپشتی بکە.

هەنگاوی هەشتەم: یەکسەر دەست بکە بە لەبەرکردن و مەڵێ ئەمڕۆ نا سبەی.

## هەنگاوی یەکەم: شەیداو ئارەزوومەندی (هەبوونی پاڵنەری خۆیی)

بەڕاستی هەبوونی پاڵنەرێکی بەهێزی خۆیەتی بریتی‌یە لە یەکەمین و بەهێزترین پاڵنەر کە مسوڵمان هانبدا بەرەو گەیشتن بە ئامانج بۆ لەبەرکردنی قورئان. وە مسوڵمانان دەتوانن لەڕێگای ئەم هاندەر و پاڵنەرانەی خوارەوە شەیداو ئارەزوومەندیان بۆ لەبەرکردنی قورئانی مەزن زیاد بکەن و گەشەی پێ بدەن:

1- زانینی ڕێز و پلەوپایەی هەڵگرانی قورئانی مەزن لەلای خوا لە دونیاو پاداشتە نەبڕاوەکەیان لە ڕۆژی دوایی، وەکو هێندێکمان لە ڕابردوو باسکرد.

2- هەڵس‌وکەوت‌و هاوەڵایەتی کردنی هەڵگرانی قورئان[1] و بیستنی بەسەرهات‌و ژیانیان، وە ئامادەبوون و بەشداری کردنی ئاهەنگەکانی دەرچوونی ئەو قوتابیانەی قورئانیان لەبەرکردووە.

3- ئامادەبوونی وانەکان بۆ شێواز و ڕێگاو بنچینەکانی لەبەرکردنی قورئانی مەزن.

4- قەدر زانین و خۆشەویستی قورئان: خۆشەویستی مەزنترین نهێنی‌یە کە بتگەیەنێ بە لەبەرکردنی قورئان، بۆیە با پەیوەندی تۆ لەگەڵ قورئان وەکو پەیوەندی دایک لەگەڵ کۆرپەکەی بێ، ئەو کاتەی دایک کۆرپەکەی لە باوەشیەتی هەست بە ئاسوودەیی دەکات و زیاتر بە خۆیەوە دەیگوشێ‌و خۆشی دەوێ. وەهەر کاتێک چاوی بە کۆرپەکەی بکەوێ زیاتر خۆشی دەوێ، وەئەگەر ببینێ کۆرپەکەی لە ناڕەحەتی‌دایە یەکسەر لە باوەشی دەگرێ. ئەمڕۆش قورئان بێ‌ناز کەوتووە دەسا با لە باوەشی بگرین‌و



---

(1) کە ئەمە یەکێك بوو لەو هۆیانەی هاندەرم بوون بۆ لەبەرکردنی قورئانی پاك و بەڕێز.

سینگمانی بۆ والآ بکەین و لەناو دڵمان جێگای بۆ بکەینەوە سا بەڵکو خوای میهرەبان و بەبەزەیی لەڕۆژی دوایی لەلای خۆی جێگامان بۆ بکاتەوە.

وەئەگەر قورئان بە ئەندازەی پێویست خۆشەویست نییە لەلامان بابێین بە تەنیا لە ژوورێك دانیشین و قورئان لەبەردەممان دانێین و چاك لێی ووردبینەوە ئینجا پڕ بە دڵ بڵێین: ئەم قورئانە فەرموودەی خوای گەورەیەو یەکێکە لە سیفەتەکانی... پاك و بێگەرد و بێ لەکە و خەوشە... هیدایەتەو پڕیەتی لە زانست و زانیاری و موعجیزە، بەڵکو هەر خۆی لە خۆیدا موعجیزەیە، یەکێك فەرموویەتی کە دروستکارمانەو چەندان فەزڵ و مننەتی هەیە بەسەرماندا، بە یەکێك ڕەوانەی کردووە کە ئەمینە... بۆ سەر دڵی کەسێك ڕەوانە کراوە کە ڕاستگۆی دەستپاکە... وە کەسانێك ئەو کات لەبەریان کرد و لە سینگیاندا هەڵیان گرت کە هەڵبژاردە و چاکترینی خەڵك بوون، وەتا ڕۆژی دوایی لە چاکەدا هەروا مانەوە... بە هۆیەوە بوونە خاوەنی دەسەڵات و سەربەرز و پووسپی دونیا و دواڕۆژ بوون... چوونە بەهەشت یان دۆزەخ بەستراوەتەوە بە ئەندازەی پابەندبوونمان بە قورئان، کەواتە بەر لەوەی لە ژوورەکە هەڵبستین و بێینە دەرەوە با قورئانەکە توند بە دڵمانەوە بگوشین و بڕیار بدەین بەرگری لێبکەین و کەمتەرخەمی نەکەین لە شارەزابوون و لەبەرکردنی، لە سەرەنجامدا هەست بکەین کە قورئان خۆشەویستر و شیرینتر بووە لەلامان، چونکە هەر کەسێك خۆشەویستی شتێك، کەسێك، کارێکی لە دڵا بێ هەوڵ دەدا بە جوانی و ڕێك و پێکی ئەم کارە ئەنجام بداو دەقاودەق وەکو خۆی جێبەجێی بکا.

دەجا هەر کەسێك قورئانی بەڕێزی خۆش بویَ ئەوا هەوڵی فێربوونی دەدا، پاشان لە خوێندنەوەو شارەزابوون و لەبەرکردنی درێغی ناکا، بەڵکو لە سەرووی هەموو کارەکانو پێشەوەی هەموو ئامانجەکانی دادەنیَ.

خۆشەویستی قورئانیش کاتێك دێتە دی- وەکو گوتمان- کە تۆ یەقینت هەبیَ کە ئەمە فەرموودەی خوایە هەر کەسێك بیخوێنێتەوە و لەبەری بکا لە خوا نزیکتر دەبێتەوەو دەبێتە دۆست و ئەهلی خوا، وە هەر کەسێك دەستی بە قورئانەوە گرتبیَو هەوڵی سەرخستنی دابیَ سەربەرزی دونیا و قیامەت بووە. وەبەپێچەوانەوە دژایەتی قورئانی کردبیَو هەوڵی لەبەرچاوخستنو ژێرخستنی دابیَ بووەتە پەندی زەمانەو بە دەردی فیرعەونو هامان و نەمرودو شەدادو باقی خراپەکارەکانیتر چووەو دەچیَ.

**هەنگاوی دووەم: پشت بە خوا بەستن و پاشان متمانە بەخۆ بوون**

لە کرداری لەبەرکردنی قورئان دوای پشت بە خوا بەستن دەبیَ متمانەیەکی تەواوت بەخۆ هەبیَ کە تۆ بێگومان لە دواڕۆژ قورئان لەبەردەکەی و دەبیتە هەڵگری. چونکە تۆ یەکەم کەس نیت هەوڵی لەبەرکردنی قورئان دەدەیت، وە ئەوانەی قورئانیان لەبەرکردووە لە تۆ زیاتر نین. بۆیە بڵیَ: پشتیوان بەخوا من دڵنیام و دڵم ڕوونە... من دەتوانم قورئان لەبەربکەم. ئەم ڕستەیە زۆر دووبارە بکەرەوە، چونکە ئەمە متمانەت پێدەبەخشیَ و وا دەکات ژیریی ناوەوە زیاتر بە جووڵە بخات و یارمەتییت بدات لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبیَ کارئاسانی بۆ ئەم کارە بکەی و ڕێگای بۆ خۆش بکەی و کۆسپ و لەمپەرەکان لەسەر ڕێگای لەبەرکردنی قورئان لابدەی.

## هەنگاوە سەرەکی یەکان بۆ لەبەرکردنی

ناپلیۆن پۆناپارت دەڵێ:(هەر کەسێك گوتی: ناتوانم! دەڵێم: هەوڵبدە. وەهەر کەسێك گوتی: نازانم، دەڵێم: فێربە، وەهەرکەسێك گوتی: ناکرێ. دەڵێم تاقی بکەوە).

وەمنیش دەڵێم:

هەر کەسێك دەڵێ: ناتوانم قورئان لەبەربکەم، دەڵێم: (هەوڵبدە، چونکە لە هەوڵدان پاداشتی خوایی بەدەست دێنی).

وەهەر کەسێك دەڵێ: قورئان نازانم، دەڵێم: ( فێربە، پاشان ببە هۆیەکیش بۆ فێرکردنی کەسانی تر ).

وە هەر کەسێك دەڵێ: ناکرێ، دەڵێم: (( ووشەی (ناکرێ) لەگەڵ کرداری لەبەرکردنی قورئان ناگونجێ، چونکە چەندان کەس لە هەموو چین و توێژەکان قورئانیان لەبەرکردووە، کەواتە لەبەرکردنی قورئان پێویستی بەتاقیکردنەوە نىیە )).

وە هەروەها لە زانای بەناوبانگ تۆماس ئەدیسۆن دەگێڕنەوە کە لە هەوڵی بەدەست هێنان و دروستکردنی گڵۆپی کارەبایی هەزار (1000)جار شکستی هێنا، جا گوتی: ( بەڕاستی من شکستم نەهێناوە لە تاقیکردنەوەکانم بەڵکو من ئێستا هەزار (1000)ڕێگای ناسەرکەوتوو دەزانم بۆ بەدەستهێنانی گڵۆپی کارەبایی) ئیدی ئەم زانایە کۆڵی نەدا و لەکۆتاییدا گڵۆپی کارەبایی بەدەست هێنا، ئێمەش سوپاسی دەکەین.

**هەنگاوی سێیەم: ئامانجت دیاری بکە!**

ئەوە دیاری بکە کە دەتەوێ قورئانی مەزن لەبەربکەی، ووزە و توانای خۆت لە لەبەرکردنی شتی جۆراوجۆر بەفیڕۆ و پەرش‌وبڵاو مەکە، وە ئەگەر دەتەوێ قورئان لەبەربکەی هەموو ڕۆژێك یان لە هەفتەی چەند ڕۆژێك کە لە هەر ڕۆژە و کاتێك دیاری بکە جگە لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن هیچ کارێکی تر ئەنجام نەدەی، وە مەڵێ ئەگەر خەریکی لەبەرکردنی قورئان بم زۆر کاری گرنگم لەدەست دەچێ و لە خەڵك بەجێ‌دەمێنم.

نەخێر! هیچ کارێك بە ئەندازەی لەبەرکردنی قورئان سوود و کەڵك و گرنگی نی‌یە، وە تەنها بەهۆی قورئانەوە بە پێش خەڵکی دەکەوی و دەبیتە گەورەی ڕاستیەقینەیان، وە قورئان لە سەرووی هەموو کارەکانەوە دابنێ و لە هەموویان بە گەورەتر سەیری بکە.

**هەنگاوی چوارەم: سوودو قازانجت لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن دیاری بکە**

سوود و قازانجت لە گەیشتن بە لەبەرکردنی قورئانی مەزن دیاری بکە، جا ئەگەر دەبینی سوود و قازانجت بچووکە ئەوا بێگومان جوڵە و چالاکیت بەرەو گەیشتن بە لەبەرکردنی قورئانی مەزن بچووك و خاو دەبێت، بە پێچەوانەوە ئەگەر گەورە بێت ئەوا بەڕاستی هەوڵ و تەقەللات بۆ گەیشتن بە لەبەرکردنی قورئانی مەزن گەورە دەبێت.

بەڕاستی سوود و قازانجت لە لەبەرکردنی قورئان زۆر مەزنترە لەوەی ئەندازە و سنوورێکی بۆ دابنێی و پاشان تۆماری بکەی.

پرسیار لە خۆت بکە: بۆچی دەتەوێ قورئان لەبەربکەی؟ ئەو سوودو قازانجانە چین لە تیجارەت لەگەڵ قورئانی مەزن بەدەستت دەکەوێ ؟

وەڵامی ئەو پرسیارانە دەبنە هاندەرێکی گەورە و پاڵت پێوە دەنێن بۆ گەیشتن و بەدیهێنانی لەبەرکردنی قورئانی بەرێز، وەکو چۆن تۆ کارێك. تیجارەتێك کە بزانی خێر و قازانجی زۆرە هەردەم لە بیری ناکەی و لێی بێئاگا نابی و بەردەوام گرنگی پێ دەدەی، ئاواش، بەڵکو سەبارەت بە قورئانی مەزن زیاتریش، چونکە تیجارەت لەگەڵ قورئان هەمووی قازانجەو زەرەرو و نائومێدی تێدا نییە، خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَـٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾ ﴾[1].

## هەنگاوی پێنجەم: دەست بکە بە کێشانی نەخشەیەك و دانانی بەرنامەیەك بۆ لەبەرکردنی قورئانی پایەدار

هەر بەرنامە و نەخشەیەکی سەرکەوتوو دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوەی تێدابێ:

1. نەخشە و بەرنامەیەکی ڕوون و ئاشکرا بێ: بۆ نموونە تۆ دەتەوێ هەفتانە پشکێك لە قورئان لەبەربکەی، دەبێ ئەو پشك و بەشە چەند و چۆنیەتیەکەی دیاری بکەی، وە یان دەتەوێ لە ماوەی دوو (2) ساڵ هەموو قورئان لەبەربکەی، دەبێ ژمارەی لاپەڕەکان بەسەر ئەو ماوەیە دابەش بکەی و لە نێوانیاندا کاتی پێداچوونەوە و پشوو و پێشبینی حاڵەتی لێقەومان وەکو نەخۆشی و هەر حاڵەتێکی تری لەم جۆرە کات نەزانراو و لەناکاو ئاماژە پێبکەی.



(1) سورة فاطر (29-30).

2. بەرنامەیەکی واقیعی و گونجاو بێ نەوەکو خەیاڵی: واتە بڕی ئەو لاپەڕانەی تۆ دەتەوێ لە هەفتەیەکدا لەبەری بکەی دەبێ بە ئەندازەی توانای بیروهۆشت بێ.

3. نەخشەیەکی گشتگیر بێ: بەجۆرێك لەبەرکردنی هەموو قورئانی بەڕێز لەخۆ بگرێ و ئاماژە بە سوڕەت و ئایەت و ژمارەی لاپەڕەی سەرەتای سوڕەتەکان کرابێ.

4. بەرنامەو نەخشەیەك بێ کە لە داهاتوودا بواری گۆڕان و دەستکاری کردنی هەبێ: چونکە تۆ لە کرداری لەبەرکردن هەرچەندە پێشبکەوی شارەزایی نوێ لەم بارەیەوە زیاتر بەدەست دەهێنی و بەهەڵەو کەم و کورتییەکان دەزانی، بۆیە نەخشەکە لە باشەوە بۆ باشتر دەگۆڕی و دەستکاری دەکەی.

ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکن لە نەخشەکان بۆ لەبەرکردنی قورئانی مەزن:

* ئەگەر لە ڕۆژێکدا دە (10) لاپەڕە لەبەربکەی، ئەوا تۆ هەموو قورئان لە شەست (60) ڕۆژ لەبەردەکەی، واتە دوو (2) مانگ.
* ئەگەر لەڕۆژێکدا شەش (6) لاپەڕە لەبەربکەی، ئەوا هەموو قورئان لە سەد (100) ڕۆژ لەبەردەکەی.
* ئەگەر لەڕۆژێکدا سێ (3) لاپەڕە لەبەربکەی، ئەوا هەموو قورئان لە دوو (200) سەد ڕۆژ لەبەردەکەی، واتە شەش (6) مانگ و بیست (20) ڕۆژ.
* ئەگەر لەڕۆژێکدا دوو (2) لاپەڕە لەبەربکەی، ئەوا بە کەمتر لە ساڵێك هەموو قورئان لەبەردەکەی.

* ئەگەر لە ڕۆژێکدا یەك (1) لاپەڕە لە قورئان لەبەربکەی، ئەوا نزیکەی بە دوو (2) ساڵ هەموو قورئان لەبەر دەکەی.
* ئەگەر ڕۆژانە نیو (1/2) لاپەڕە لەبەربکەی، ئەوا نزیکەی بەچوار (4) ساڵ هەموو قورئان لەبەردەکەی.
* وەئەگەر هەفتانە ڕوبعەحزبێك لەبەربکەی ئەوا نزیکەی بە شەش(6) ساڵ هەموو قورئان لەبەردەکەی[1].

جا برایانی عەزیزو خوشکانی بەڕێزم: جوان بڕوانە هەریەك لەم نەخشانە و سەیربکە کامیان لەگەڵ توانا و سەرقاڵیت دەگونجێ ئەوە پەیڕەو بکە و لەسەری بڕۆ، خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾[2].

**هەنگاوی شەشەم: وا بێنەپێش چاو و خەیاڵت کە تۆ گەیشتی بە ئامانجەکەت و یەکێکی لەوانەی قورئانیان لەبەرە**

دەروونناسان دەڵێن: ( ئەگەر وا خەیاڵ ببەیت کە ئامانجەکەت هاتۆتە دی، ئەوا ئەمە پێویستی بە سێ (3) شت هەیە: تێبینی زیاتر، داهێنانی زیاتر، گوڕ و تین و هیممەتی زیاتر ).

خەیاڵ و هێنانە پێش چاو سەرچاوەی ووزەیە، تیشك و بڵێسەی داهێنانە، خەیاڵی خوو پێوەگرتوو هەقیقەت دروست دەکا.

جا وا خەیاڵ ببە کە تۆ هەموو قورئانت لەبەرکردووە و دڵ و بیرت پڕە لە نور و ڕۆشنایی قورئان، دوای ئەم خەیاڵانە هەست دەکەی زۆر



(1) با سەیری خۆمان بکەین تا کەم تەرخەمی زۆربەمان بەرامبەر بە قورئان زیاتر بەدیاربکەوێ کە چەند شەش(6) ساڵ لە تەمەنمان تێپەڕکردووە کەچی تا ئێستا قورئانمان لەبەرنەکردووە.

(2) سورة العنكبوت (69).

خۆشحاڵی و دەروون و لایەنی مەعنەویت بارگاوی بووە بە هیممەتێکی زۆرو وورەیەکی سەیر، ئەمە زیاتر پاڵت پێوەدەنێ بۆ لەبەرکردنی قورئان.

**هەنگاوی حەوتەم: گەیشتن بە لەبەرکردنی هەموو قورئان بە هیمەت و وورە بەرزی پاڵپشتی بکە**

بڕیار بدە کە نابێ لە گەیشتن بە لەبەرکردنی هەموو قورئان پاشگەز ببیتەوەو بگەڕێیتەوە دواوە، وە هەرچی نەخۆشی و ناخۆشی و زەحمەتی و کۆسپ و لەمپەر بێنە پێش و لە باش لەبەرکردنی قورئان شکستت پێ بێنن، بڵێ: دەبێ هەر بەردەوام و خۆڕاگریم، وە هەر کاتێک کەوتم هەڵبستمەوە.

**هەنگاوی هەشتەم: یەکسەر دەست بکە بە لەبەرکردن و مەڵێ ئەمڕۆ نا سبەی**

قەت مەڵێ بەیانی دەست دەکەم بە لەبەرکردنی قورئان! نەخێر بەڵکو ئێستا و لەم ساتە دەست بکە بە لەبەرکردن.

خۆت فێری ئەم ڕستەیە بکە: هەر ئێستا.

لە (نیتشە) پرسیار کرا: چۆن بگەم بە لوتکە؟

گوتی: کات بەدەستەوە نیە ماوە بدا بە بیرکردنەوە... بەڵکو بەرەو لوتکە دەست بکە بە سەرکەوتن.

هەر کەسێک قورئانی بەرێزی خۆش بوێ ئەوا هەوڵی فێربوونی دەدا، پاشان لە خوێندنەوەو شارەزابوون و لەبەرکردنی دریغی ناکا، بەڵکو لە سەرووی هەموو کارەکان و پێشەوەی هەموو ئامانجەکانی دادەنێ

## بەشی پێنجەم

# پچڕاندن و شکاندنی کوت و زنجیرەکان

**کۆت و زنجیری یەکەم:** سەرقاڵم و کاتی تەواوم بەدەستەوە نییە

**کۆتو زنجیری دووەم:** زەینم زۆر پەرش و بڵاوە و ساف نییە، وە تەرکیز و ووردبوونەوەم بە دیقەت نییە

**کۆتو زنجیری سێیەم:** هەر کاتێك دەست بکەم بە لەبەرکردنی قورئان دووچاری سستی و ساردی و بێزاری دەبم

**کۆت و زنجیری چوارەم:** تەمەنم گەورەیە و تازە بە جێماوم، لەبەرکردنیش تایبەتە بە منداڵو گەنجەکان

**کۆت و زنجیری پێنجەم:** لەبەرکردنی قورئان بەهرەیەکی خوایەو خوا کێ ی بوێ بۆ ئەم کارە ئەو هەڵدەبژێرێ

**کۆت و زنجیری شەشەم:** لەبەرکردنی قورئان کارێکی زەحمەتە

**کۆت و زنجیری حەوتەم:** هەرکاتێك بمەوێ قورئان لەبەربکەم کەس و کار و هاورێیەکانم ساردم دەکەنەوە

**کۆت و زنجیری هەشتەم:** بیروهۆشم بێهێز و لاوازە، هەر کاتێك قورئان لەبەردەکەم لەبیرم دەچێتەوە

**کۆت و زنجیری نۆیەم:** من قورئانی مەزن لەبەرناکەم لە ترسی ئەوەی نەوەکو لەبیرم بچێتەوە، چونکە ئەمە تاوانە

**کۆت و زنجیری دەیەم و کۆتایی:** قورئانی مەزن لەبەرناکەم نەوەکو تووشی ریایی و بەرچاوی بم.

شەیتان بۆ هەر کارێکی چاك و خێر چەندان کۆسپ و کۆت دەخاتە پێش، وە زۆربەی ئەو کۆسپ و کۆتانەی ئیمانداران لە دڵ و بیری خۆیاندا هەڵی دەگرن و بەهانەی پێدەگرن بۆ نەکردنی کاری خێر بە تایبەتی بۆ لەبەرنەکردنی قورئانی مەزن چەند بەهانەیەکی وەهمی و ئەندێشەیی و بێبنەمان و دوورن لە ڕاستی.

ئەم جۆرە وەهمانەی کە خۆی لە کۆت و زنجیرەکاندا دەبینێتەوەو ئێمە مەبەستمانە باسی بکەین لە زۆر ڕێگەوە خزێنراونەتە بیرو هەستی زۆربەی خەڵکی، جا یان لە ڕێگەی سستی و لاوازی دەروونی کەسەکە خۆی، یان سەرنەکەوتن و شکستی دووبارە لە کرداری لەبەرکردن، یان لە ڕێگەی خزم و کەسەکان، وەیان هاوڕێیە دۆڕاوەکان، وەیاخود ئەوانەی لایان ناخۆشە خەڵکی دەست بە قورئانەوە بگرن و لەبەری بکەن و ئێرەیی دەبەن. جا پێش ئەوەی بچینە سەر بابەتەکە دوو تێبینیمان هەیە:

تێبینی یەکەم: بۆ پچڕاندن و شکاندنی هێندێك لە کۆت و زنجیرەکان دەبێ لە کاتی لەبەرکردن پەیڕەوی یاساو بنچینە سەرەکییەکانی لەبەرکردنی قورئان بکەین.

تێبینی دووەم: ئەم خاڵانەی لەم بەشەدا بە کورتی باس کراون، لەبەرئەوە بووە کە بە پێویست نەزانراوە زیاتر باس بکرێ، وە یان لە بەشێکی ترو بابەتێکی تر بە تێر و تەسەلی باسمان کردوون.

**کۆت‌و زنجیری یەکەم: سەرقاڵم و کاتی تەواوم بەدەستەوە نیە:**

بزانە کە بە نرخترین کار کە بتەوێ کاتی بۆ ببەخشی و لەپێناویدا سەرفی بکەی بریتی‌یە لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن، وە هەر کەسێك غەیری قورئان بە سەر قورئان فەزڵ بکا وەکو کەسێکە کە غەیری خوا بە گەورەتر دابنێ لە خوا، پەنا بەخوا.

* قورئان بکە کارێك لە کارە گرنگەکانت، وەپرسیار لە خۆت بکە: ئەوەی لە کاروباری ڕۆژانەتدا دروێنەی دەکەی بەروبوومەکەی چی‌یە؟

*وەئەوەی لە خوێندنەوەو لەبەرکردنی قورئان دروێنەی دەکەی بەرهەمەکەی چی‌یە؟

ئەمانە هەریەکەو لەلا تەرازوویێك دابنێ‌و سەیری سەرەنجامەکەی بکە:

دەبینی پیتێك لە قورئان چاکەیەکە، وەچاکەش یەك بە دە(10)یە، تا حەوت سەد (700)و زیاتریش ئەگەر خوا بیەوێ، کە زاد و زەخیرەیەکی زۆرە بۆ دواڕۆژ.

بەڵام ئەوەی لە ماندووبوون‌و سەرقاڵیت بۆ دونیا بەدەستی دێنی دەبڕێتەوەو لەناودەچێ. خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ وَلَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُوا أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٩٦) ﴾،

وەدەفەرموێ: ﴿ فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٣٦) ﴾.

* پاشان دونیا ئەوەندە ناهێنێ تا شەو و ڕۆژی بۆ لەسەریەك دابنێی‌و لە باوەشی بگری.

* پاشان کاتی زۆرمان هەیە کە هەندێك جار لە کاری بێکەڵك و بێسوود بەسەری دەبەین‌و بەفیڕۆی دەدەین، وەکو لە بازاڕو سەردانی بێبەرنامە، تەماشاکردنی تەلەفزیۆن‌و ئینتەرنێت‌و... هتد، خۆ ئەگەر

ڕۆژانە کاتژمێرێك وەیان هەفتانە چەند کاتژمێرێك لەوانەی باسمان کردن بگرینەوە ئەوا بەئاسانی دەتوانین پەڕێك لە قورئانی مەزن لەبەربکەین و پێداچوونەوەیەکی جوان و ڕێکوپێکی لەبەرکراوەکە بە بەردەوامی بکەین، وەکو زانایان دەڵێن:" گەر کەسێك کەمترین زەکاوەت و زیرەکی هەبێ دەتوانێ لە ماوەی کاتژمێرێك لاپەڕەیەك لە قورئان لەبەر بکا".

**کۆت و زنجیری دووەم: زەینم زۆر پەرش و بڵاوە و ساف نییە، وە تەرکیز و ووردبوونەوەم بە دیقەت نیە:**

ئەوەی دەیەوێ قورئان لەبەر بکاو لە حاڵەتی پەرش و بڵاوی زەین و بێتەرکیزی بیر بۆ خاوێنی و بێخەوشی مێشك بگوازرێتەوە دەبێ پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکا:

1- با دونیا لە دەستی بێ و ئاخیرەتیش لە دڵی: چونکە دونیا بریتییە لەوەی کە لە خوا سەرقاڵی دەکا، وە کاری ئاخیرەتیش بریتییە لەوەی کە بە خوا سەرقاڵی دەکات.

2- خاوێن و پاکژ کردنەوەی زەین و بیر: ئەمەش بەوە دەبێ کە لە ڕێی وەرگرەکانیەوە کە هەستەکانن (بینین و بیستن) زەین سەرقاڵ نەکرێ تەنها بەوە نەبێ کە سوود و قازانجی تێدایە، بە تایبەتی سوود و قازانجی قیامەت.

3- قۆستنەوەو بەکارهێنان و سوود وەرگرتن لە کاتە بێخەوش و سافەکان: کاتی سەحەر و دوای نوێژی بەیانی لە هەموو کاتەکان پاك و خاوێن و بێگەردو سافترن بۆ کرداری لەبەرکردن، وەهەروەها کاتژمێرێك بەر لە نووستن کە ژێری ناوەوە لە کاتی نووستن هەڵدەستێ بە شیکردنەوەی کۆتا زانیاری کە بۆ دەماخ هاتووە، پاشان خەزن کردن و جێگیرکردنی.

4- دوورکەوتنەوە لە سەرپێچی و گوناه، کە ئەمە سەری هەور و بنی گەوارانە، بەتایبەتی چاو، کە بە هۆی گوناه کردن‌و ئەنجامدانی تاوان بیروهۆش بێ‌هێز و دووچاری پەرش‌و بڵاوی دەبێ.

5- هاوڕێیەتی کەسێك هەڵبژێرە کە لەخەوی غەفڵەت‌و بێئاگایی ڕات پەڕێنێ‌و بەخوات بگەیەنێ: با کەسێکی دڵسۆزو ڕاستگۆت هەبێ، کە غەم‌و پەژارەکانیشی لەلا باس بکەی، ئەگەر کارێکت لەبیرکرد بەبیرت بێنێتەوە، ئەگەر لەبیرت بوو یارمەتیت بدا، وە ئەگەر چاکەیەکت لێ ببینێ بڵاوی بکاتەوە، وە ئەگەر ناڕێکی‌و خراپەیەکت لێ ببینێ دایبپۆشێ.

**کۆت‌و زنجیری سێیەم: هەر کاتێك دەست بکەم بە لەبەرکردنی قورئان دوای ماوەیەك دووچاری سستی‌و ساردی‌و بێزاری دەبم:**

یەکەم هۆکار لە هۆکارەکانی سستی و بێزاری بریتی‌یە لە نەبوونی هاندەری دەرەکی و پاڵنەری خۆیی لەلای ئەوەی دەیەوێ قورئان لەبەر بکا، وە هەر کاتێك ئەم دووانە هەبوون مرۆڤ دەتوانێ زاڵ ببێ بە سەر ساردی و بێزاری.

وەبۆ زاڵ بوون بە سەر سستی و بێزاری:

* پێویستە لە کاتی خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئان هەموو هەستەکانی خۆشحاڵی و بەختەوەری داوا و ئامادەبکەی و هەوڵبدە لە خوێندنەوەیدا چێژ وەربگری[1] چونکە تۆ یەکێك لە چاکترین و باشترین کار لە ژیانت ئەنجام دەدەی، وە لەگەڵ چەند بارە کردنەوەی

---

(1) لە بەرگی یەکەم لە بابەتی ئیمان و قورئان باسی ئەوەمان کرد کە پێویستە پێش قورئان ئیمان فێرببین، بۆ ئەوەی لە کاتی خوێندنەوەو لەبەرکردنی چێژ وەربگرین‌و دووچاری بێزاری نەبین، خەلیفەی سێیەمیش ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ:(لو أن قلوبنا طهرت ما شبعنا من كلام ربنا).

ئـەم کـرداره هەسـت دەکـەی تـۆ هـەر کاتێـك قورئـان بخوێنیتـەوە خۆشحاڵو بەختەوەری، وەساردیو سستی ڕووت تیّ ناکا.

* وەهەرکاتێك بتەویّ قورئان بخوێنیتەوە یان لەبەری بکەی:

– وا بێنـە پـێش چـاوت کـە هـەموو قورئانـت لەبـەرکردووە، ئەمـە بەختەوەریت پیّ دەبەخشیّ و خۆشحاڵیت زیاتر دەکات.

– وا دابنیّ کە تۆ گفتوگۆ لەگەڵ خوای گەورە دەکەی.

– وا دابنیّ کە قورئان لەخوای مەزن دەبیستی.

هەموو ئەمانە سستی و ساردیو بێزاری لەناودەبەنو پاڵت پێوەدەنێن بۆ زیاتر خوێندنەوەو لەبەرکردنی قورئان.

باوکی بیریاری ئیسلامیو شاعیری هیندی موحەممەد ئیقبال دەیگوت: (ئەی موحەممەد وا قورئان بخوێنەوە وەکو ئەوەی بۆ سەر تۆ دابەزیبیّ).

* وەئەو کاتانـەی لـە ماوەی پـشوودای و زۆر خۆشـحاڵ و بەختـەوەری و زەیـنو بـیرت سـافە دەسـت بکـە بـە لەبـەرکردنی قورئـان، چـونکە ئەمـە چاکترە بۆ چالاکی زەینو لاشەو دامەزراوترە لە بیروهۆش.

* وەهەروەها هەڵبژاردنی شوێنێکی هێمنو گونجاوو لەبار هۆکارێکی تـرە بۆ چوستو چالاکی زەینو نەبوونی بێزاری.

**کۆت و زنجیری چوارەم: تەمەنم گەورەیە و تازە بە جێماوم، لەبەرکردنیش تایبەتە بە منداڵ و گەنجەکان:**

هەر کەسێك ووڕەو هیمەتی بەرز بێ لە هیچ کارێکی چاك بەجێ نامێنێ با تەمەنیشی گەورەبێ، وەهەر کەسێك سستو ساردو بێ جموجۆڵ بێ بە دوادەکەوێو بەجێدەمێنێ با گەنج و بچووکیش بێ، وەهەر کەسێك خۆشەویستی دونیا لە ناو دڵ و بەردەوام لە بەرچاوی بێ هەوڵی بۆ لەبەرکردنی قورئانی مەزن کەم دەبێو زیاتری بۆ دونیا دەبێ.

لە خوای گەورە نزا دەکەین و دەپاڕێینەوە: بمانگێڕێ لەو کەسانە کە هەوڵی زیاتریان بۆ خەمی قیامەتیانە.

وە خەڵکانێکی زۆر لە پیاو و ئافرەت، لە کۆن و ئێستا لە تەمەنێکی گەورەدا هەموو قورئانیان لەبەرکردووە[1]، بۆیە زانایان گوتویانە: گەورەکان زەین کراوەترن، بەڵام بە دونیا سەرقاڵترن. کەواتە تەمەن گەورەیی بیانوێکی دروست نییە بۆ لەبەرنەکردنی قورئان.

ئینجا لەگەڵ ئەوەی گەورەکان بیانوو بە تەمەن گەورەییان دەهێننەوەو دەڵێن: لەبەرکردن تایبەتە بە منداڵ و گەنجەکان کەچی لەهەمان کاتدا لەگەڵ منداڵەکانیان هەوڵ نادەن تا قورئانیان پێ لەبەربکەن و پشتگوێیان خستوون.

---

(1) بە ویستی خوا لە بەرگی سێیەم چەند نموونەیەکیان لێ باس دەکەین.

**کۆت و زنجیری پێنجەم: لەبەرکردنی قورئان بەهرەیەکی خوایە و خوا کێ ی بوێ بۆ ئەم کارە ئەو هەڵدەبژێرێ:**

ئەگەر لەبەرکردنی قورئان بەهرەیەکی خواییەو خوای گەورە کێ ی بوێ پێ ی دەبەخشێ، باشە بۆ تۆ هەوڵ نادەی تا یەکێك بیت لەو کەسانەی بەر ئەم بەهرە خواییە بکەوی.

کەواتە: کورد گوتەنی: (لە تۆ حەرەکەت و لە خواش بەرەکەت) هەرچەندە جاری وابووە بە بێ حەرەکەتیش لەخوا بەرەکەت بووە.

**کۆت و زنجیری شەشەم: لەبەرکردنی قورئان کارێکی زەحمەتە:**

زەحمەتی لەبەرکردنی قورئان خەیاڵێکە بیروهۆشی خەڵکانێکی زۆری داپۆشیوە لەوانەی دەیانەوێ قورئانی بەرێز لەبەربکەن، بەڕاستی خوای گەورە ئاسان لەبەرکردن و تێگەیشتن لە قورئانی بۆ ئێمە ڕوون کردۆتەوەو بەڵێنی داوە یارمەتیمان بدا ئەگەر هەوڵی بۆ بدەین هەروەکو لەسەرەتای بەشی یەکەم لە فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ۝١٧﴾[1] باسمان کرد کە قورتوبی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ:(أي سهلنا للحفظ وأعنا عليه من أراد حفظه، فهل من طالب لحفظ القرآن فيعان عليه؟).

واتە: (ئەم قورئانەمان ئاسان کردووە بۆ لەبەرکردن و ئەوەی بیەوێ لەبەری بکا یارمەتی دەدەین، جا کەس هەیە داوای لەبەرکردنی قورئان بکات تا یارمەتی بدەین و پاڵپشتی لێ بکەین؟).

تێبینی: قسەیەك هەیە لە ناو مسوڵمانان باوەو زمانیان پێوەگرتوە کە دەڵێن:( ئەو سورەتە لەو سورەتە زەحمەترە وەیاخود ئەو ئایەتە لەو

---

(1) سورەتی القمر (17،22،32،40).

ئایەتە زەحمەترە) کە بەڕاستی ئەمە قسەیەکی ناڕاستە بەدەقی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾. بۆیە پێویستە بگوترێ: ئەو سوڕەتە لەو سوڕەتە ئاسانترەو ئەو ئایەتە لەو ئایەتە ئاسانترە .

وەبۆ ئەوەی ئەم جۆرە خەیاڵە نەیەتە بیروهۆش، وەیان ئەگەر بوونی هەیە، بڕەوێتەوە پێویستە: ئەوەندە پشكو بەشە بکە بەرنامەو لەبەری بکە کە بتوانی جێبەجێی بکەی.

1- بەس سەیری ئەو لاپەڕەیە لە قورئان بکە کە لەبەری دەکەی، زەین و بیرت پەرش و بڵاو و ماندوو مەکە بەوەی سەیری لاپەڕەکانی تری قورئان بکەی و لە سەرەنجامدا بە زەحمەت و گران بێتە بەرچاوان و ئەم خەیاڵەت لەلا دروست بێ.

2- پاشان خەڵکانێکی زۆر وەکو تۆ لەبەرکردنی قورئانیان لەلا زەحمەت هاتۆتە بەرچاو بەڵام کۆلیان نەداوەو خۆیان لەگەڵ ماندووکردووەو نەیان هێشتووە ئەم پاداشتو ڕێزو سەربەرزییە لە دەست خۆیان بدەن، بۆیە سەرەنجام هەر لەبەریان کردووەو بە ئامانج گەیشتوون.

عەلی کوڕی ئەبو طالب ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ[1]:

بقدر الكد تكتسب المعالي ... ومن طلب العلا سهر الليـالي

تريـد العـز ثم تنـام ليـلا ... يغوص البحر من طلب اللآلي

---

(1) إيقاظ الهمم شرح متن الحكم العطائية لابن عجيبة، سر العالمين وكشف ما في الدارين للغزالـي (1 9). فاكهة الخلفاء ومفاكهة الظرفاء لابن عربشاه (1/142).

واتە:

به ئەندازەی هەوڵ و ماندووبوون بەرزییەکان بەدەست دێن...

وەئەوەی داوای بەرزی بکات شەونخونی بۆ دەکات...

عیززەت و سەربەرزیت دەوێ ئینجا شەو دەخەوی...

ئەوەی مرواری بوێ دەچێ لە ناو بەحر لێی دەگەڕێ...

**کۆت و زنجیری حەوتەم: هەرکاتێك بمەوێ قورئان لەبەربکەم کەس و کارو هاوڕێیەکانم ساردم دەکەنەوە:**

زۆر لە کەس و کار-ئەوانەی دوورن لە مێرگی ئیمان و قورئان- ئەگەر منداڵەکانیان ویستیان قورئان لەبەربکەن هەڵدەستن بە خەفەکردنیان، ئەمەش بەهۆی ڕۆچوونیان بە دونیای فانی و نەزانیان بە قەدرو قیمەت و نرخی قورئان و هەڵگرانی.

جا بۆ ئەو جۆرە کەسانە دوو پەیام دەنێرین:

**پەیامی یەکەم:** دایك و باوکی بەڕێز: یەکێك لەو سێ هۆیانەی کە دایك و باوك دوای مردنیان سوودی لێ دەبینن و بەکەڵکیان دێت کوڕو کچە پەیوەیستەکەیانە بەشەرعی خوا، جا چ کەسێك هەیە لەو کوڕ وکچە باشتر بێ کە پەیوەستە بەشەریعەتی خوا وخەریکی لەبەرکردنی قورئانی مەزنە؟

**کەواتە:** با وریا بین لەوەی ڕێگری بکەین منداڵەکانمان هەوڵی لەبەرکردنی قورئان بدەن و پەیوەست بن بە شەریعەتی خوا، چونکە بەڕاستی هۆیەکی چوونە بەهەشتمان لە کیس دەچێ.

**پەیامی دووەم:** برا و خوشکی بەڕێز! ئەگەر دەتەوێ قورئان لەبەربکەی گوێ مەدە لۆمەی لۆمەکاران. وە با تەنها قورئان سەر قاڵت بکا و لامەکەوە بەلای ئەوانەی ڕەخنەی ڕووخێنەر و تانە و تەشەرت ئاڕاستە دەکەن. وە لەگەڵ ئەم جۆرە هاوڕێیانە هەڵس وکەوت مەکە کە ساردت دەکەنەوە.

چونکە تۆ مادام خۆت دەناسی و توانای خۆت دەزانی پێویستە خۆڕاگر و بەئارام بی بەرامبەر ئەوەی ئەوان داوای دەکەن.

فیساگۆرس دەڵێ: (بەردەوام بەختەوەر و خۆشحاڵ بە، هەرچەندە ئەوانەی ئیرەیی دەبەن زۆرن، چونکە ئەمە شاهێدی ئەوانە بۆ سەرکەوتنی تۆ).

کەواتە: ئەوانەی باس کران – لە ساردکردنەوەو تانەو تەشەرو هێندێك جاریش بەسووك سەیرکردن– هەردەم با پاڵنەر بن نەوەکو ڕێگرو دواخەر، وەهەر کەسێکیش لەبەر لۆمەی لۆمەکاران قیامەت و قازانجی خۆی بەقوربانی گەمەو گاڵتەو ڕابواردنی کەسانێکی تر بکات ئەوە زیانباری دونیاو زەرەرمەندی قیامەتە و ڕەزامەندی خوا لە دەست دەدات.

کۆت و زنجیری هەشتەم: بیروهۆشم بێهێز و لاوازە، هەر کاتێك قورئان لەبەردەکەم لەبیرم دەچێتەوە:

زۆربەی خەڵکان شەکوای حاڵیان لەدەست لاوازی و بێهێزی بیروهۆشیان دەکەن، لەوانەیە ئەم لاوازییە زگماك بێ و بەدەست خۆی نەبێ، وە لەوانەیە بەهۆی پەرش‌وبڵاوی، یان کەم بەکارهێنانی بیری بێ، کە ئەمەش لەلای گەنجەکان زۆر باوە، بۆیە چەند کارێك هەیە بۆ چارەسەری کێشەی لاوازی بیروهۆش بە کەڵکە. لەوانە:

1. بەکارهێنانی ئەو خواردن و خواردنەوانەی بیروهۆش بەهێز دەکەن. کە –إنشاء الله– لە بەشێکی سەربەخۆدا باسی لێوە دەکەین.
2. چەند بارەکردنەوەی ئایەت و سوڕەتەکان.
3. بەکارهێنانی هەستەکان (بیستن و بینین و بەرکەوتن): کارێکی زۆر گرنگە کە تۆ بتوانی گەورەترین ئەندازە لە هەستەکان بەکاربهێنی. چونکە مرۆڤ بە هەموو هەستەکانی زانیاری وەردەگرێ و خەزنی دەکا.

بەڵام هەر یەکەیان بە ڕێژەیەکی جیاواز، هەستی چاو بەڕێژەی(70٪)، هەستی بیستن و گوێ بە ڕێژەی(20٪)، هەستی بەرکەوتن بە ڕێژەی (10٪)، جا ئەگەر زۆر بە جوانی و بە ووردی بۆ ئایەتەکانی قورئانت ڕوانی و دیقەتت دا و بە دەنگێکی بەرز و بیستراو کە خۆت گوێت لێبێ خوێندتەوە، پاشان نووسیتەوە کەواتە تۆ (100٪)ی هەستەکانت بەکارهێناوە، واتە تۆ ئەوەی لەبەرت کردووە لە سێ (3) شوێنی دەماخ خەزنت کردووە، بە واتایەکی تر: ئەگەر وێنەی ئایەتەکانی ئەو لاپەڕەیەی لەبەرت کردووە لەبیرت چوو، ئەوا بەو ئاواز و دەنگەی گوێت بیستوویەتی و لەبەرت کردووە دێتەوە بیرت، وە ئەگەر نا کرداری نووسینەوەکە سوودی دەبێ و دێتەوە بیرت، بۆیە لە کرداری لەبەرکردندا لەسەر قوتابی پێویستە لەلای مامۆستایەك یان لەسەر کاسێتێك گوێ بگرێ، پاشان لەسەر موصحەفەکە بە ووردی و بە جوانی ئایەتەکە بڕوانێ و بخوێنێتەوە، ئینجا بە نووسینەوە پاڵپشتی بکا. ئەمە وا دەکا لەبەرکردنەکەی زۆر پتەو و قایم بێ و بە ئاسانی لەبیری نەبرێتەوە.

4. ئامادەکردنی زەین و تەرکیزی زیاتر: ئەمەش بەوە دەکرێ زەین لە پەرش وبڵاوی و زۆر سەرقاڵی و کاری لاوەکی بپارێزی و ئاراستەی بکەی بەرەو یەك ئامانج کە گەیشتنە بە لەبەرکردنی هەموو قورئان.

5. دوورکەوتنەوە لە گوناه و تاوان و سەرپێچی کردنی خوای گەورە، ئەمەش لە ئادابە تایبەتی و گشتییەکان و چەندان شوێنی تر باسمان کردووە.

**تێبینی:** لەبیرچوونەوە لە مرۆڤەکان شتێکی خواڕسکەو هەریەکەیان بە ئەندازەیەك ئەم حاڵەتەی لێ بەدی دەکرێت، تەنانەت پێغەمبەر محمد صلی الله علیه وسلم لەمەدا لەکاتی دابەزینی سروش گرفتی هەبوو تا خوای گەورە لەبەرکردنی قورئانی ئەوی بەخۆی سپارد، کە دیارە ئەمەش -والله أعلم- لەبەر ئەرکی پێغەمبەرایەتی کە تەبلیغەو نابێ هیچی لێ بفەوتێ و لەبیربچێت، جا هەموو ئەوانەی قورئانیان لەبەرکردووە لەکاتی لەبەرکردن و پێداچوونەوەیدا هەریەکەیان بەئەندازەیەك ماندوو بووەو شەونخونی بۆ کردووە تا بەم ئامانجە گەیشتووە. بۆیە ئەگەر تۆ بتەوێت قورئان لەبەر بکەی بەڵام هەر لەسەرەتادا پێداچوونەوەیەکی چاك و خۆتی لەگەڵ ماندوو نەکەی ؛ وەبتەوێ لەبیرت نەچێت ئەوا مەحاڵەو ئەم خەیاڵە لەبیری خۆت دەربهێنە، چونکە وەکو کورد گوتەنی: (دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە).

کەواتە براو خوشکی بەڕێزم: دوعا بکەو هەوڵ بدە تا بێبەش نەبیت لەم پاداشتە خوایییە لەبن نەهاتووە... وەهەر کەسێك کار نەکات ناخوات. ﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴿٦١﴾﴾[1]

---

(1) سورەتی الصافات(61).

**کۆت و زنجیری نۆیەم: من قورئانی مەزن لەبەرناکەم لە ترسی ئەوەی نەوەکو لەبیرم بچێتەوە، چونکە ئەمە تاوانە:**

لە سەرەتادا هەموو ئەو فەرمووادانەی هەڕەشە و سەپاندنی سزا لە ڕۆژی دوایی لە لەبیرچوونەوەی قورئان دوای لەبەرکردنی دەکەن لاواز و بێهێز (ضعیف)ن، پاشان لەبیرچوونی قورئان لەبیرچوونی سنوور و حوکمەکانیەتی نەوەکو ووشە و ئایەتەکانی، هەرچەندە کەسێك ووشە و ئایەت و سنوور و حوکمەکانی پاراستووە وەکو کەسێك نییە کە نیوەی ئەمانەی پاراستووە.وەکەسانی واهەیە چاوەکانی نابینایەو ناتوانێ ببینێ تا بەهۆیەوە زەینی سەرقاڵ بێ و گوناه ئەنجام بدات کەچی قورئانی لەبیردەچێتەوە، بۆیە دەڵێین وەکو لە کۆتی هەشتەم گوتمان لەبیرچوونەوە شتێکی خوارسکەو لە مرۆڤەکاندا هەیەو نابێتە بیانوو بۆ هیچ کەسێك تا قورئان لەبەرنەکات، تەنانەت پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم لەمەدا گرفتی هەبوو وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾﴾.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ هەڵگری قورئان پەیمان لەگەڵ کەلامی خوا ببەستێ کە بیپارێزێ و لەبیری نەکات هەروەکو چۆن بە نرخترین و نایابترین شت لەلای لەبیری ناکاو وەکو گلێنەی چاوی دەیپارێزێ، وەئەگەر هەوڵی نەدا بەردەوام قورئانی لەبیردا بمێنێتەوە ئەوا بێگومان خۆی بێبەش و مەحروم دەکا لەو هەموو فەزڵ و گەورەیی‌یەی لە بابەتەکانی ڕابردوو باس کران، وەهەر کەسێکیش بە چاکەو خراپەی خۆی نەزانێ دەبێ فێر بکرێ.

**قورئانی مەزن لەبەرناکەم نەوەکو تووشی ڕیایی و بەرچاوی بم:**

ئەم جۆرە بیرکردنەوە و لێکدانەوەیە لە هەر کارێکی چاك زۆر بێ‌جێ و بێ‌بنچینەیە چونکە مرۆڤ ئەوەندە قەرزاری مننەت و نیعمەتەکانی خوایە ئەگەر ژیانی بەقەد تەمەنی دونیا بێ‌و هەمووی لە خوا پەرستی سەرف کردبێ هێشتا نەیتوانیوە پاداشتی قەرزەکەی بداتەوە چ جای لەو تەمەنە کورتەی و بە لەبەرکردنی قورئان‌و خوا پەرستی‌یەکانی تر، کەواتە تۆ بەرامبەر زۆری چاکە و نیعمەتەکانی خوا لە پاداشتیدا ئەوەندەت بۆ نەکردووە، چ جای ئەوەی ڕیایشی تێدا بکەی، پاشان لە کردنی هەر کردەوە و قسەیەك پێش ئەوەی خەڵك بمانبینێ، خوا دەمانبینێ، دیتنی ئەویش بۆ ئێمە بەسە.

وەبەهانەی ئەم جۆرە کەسانە کە دەڵێن لەبەر ڕیایی قورئان لەبەرناکەین نزیکە لە بەهانە بێ‌مانایەکەی جوددی کوڕی قەیسی دووڕوو کە دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە لەگەڵتان نەیەم بۆ غەزای تەبوك چونکە من زوو بە ئافرەت هەڵدەخەڵەتێم و ڕۆمەکانیش ئافرەتی جوانیان هەیە با دووچاری گوناه و فیتنە نەبم، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزاند[1]: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ائْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّي ۚ أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾[2].



---

(1) أخرجه إبن أبي حاتم في التفسير رقم(9600)، والألباني في الصحيحة(2988).

(2) سورة التوبة (49).

دواکەوتن و نەچوون بۆ غەزا خۆی لە خۆیدا گوناه و فیتنەیە، بۆیە نەدەبوایە جودد بیانوو بە هەڵخەڵەتانی بە ئافرەتی ڕۆمەکان بگریٚ و نەچیٚ بۆ تەبوك.

بەڵیٚ؛ ئەم قسەیە: (لەبەر ڕیایی قورئان لەبەر ناکەم) قسەیەکی بیٚبنەماناو بیٚجیٚیەو لە مسوڵمانی ڕاستەقینە ناوەشیٚتەوە. چونکە ئەگەر ئەم بۆچوونە ڕاستو بەجیٚ بیٚ دەبیٚ ئیٚمە واز لە چەندان خواپەرستی تر بیٚنین کە بە ئاشکرا دەکریٚن، بۆیە ئەو کەسە لەجیاتی ئەم قسەیە دەبیٚ بڵیٚ: مادام هیٚشتا نیازو نیەتم بۆ خوا ساغ نەبۆتەوە دەبیٚ ژیان لەگەڵ قورئان ببەمە سەر تاوەکو بەتەواوی بۆ خوا یەکلا و خاویٚن ببمەوە.

کەواتە تۆ بە لەبەرکردنی قورئان دەبیٚ زیاتر لە خوا نزیك بیتەوەو خۆتی بۆ یەکلابکەیتەوە، وەتەنها زاتیٚك چاوی لیٚت بیٚ و هەست بە چاودیٚری کردنی بکەی خوای گەورەیە، بۆیە بە ناوی خوا ناوی لیٚ بیٚنەو بڵیٚ: خوای بەبەزەیی.. پەروەردگارو دروستکارم! بۆ تۆ و لەبەر تۆ و لە پیٚناوی تۆ دەست دەکەم بە لەبەرکردنی قورئانو تۆش یارمەتیم بدەو دڵو دەروونو بیرم بپاریٚزە لە ڕیاییو بەرچاوی.

ئیتر بەهیوای ئەوەی بەم ئەندازەیە قوفڵی دەرگای دڵەکان شکابنو لە ئامادەباشی دابن بۆ پیٚشوازی کردن لە میوانداری کردنی قورئانو خزمەت و لەبەرکردنی.

**زانایانی پسپۆر لەبواری لەبەرکردنی قورئان دەڵیٚن: گەر کەسیٚك کەمترین زیرەکی هەبیٚ دەتوانیٚ لەماوەی کاتژمیٚریٚك لاپەڕەیەك لە قورئانی مەزن لەبەر بکات.**

## بەشی شەشەم

# ئاداب و ڕەوشتەکانی هەڵگری قورئان

لە بەرگی یەکەم چەند ئاداب و ڕەوشتێکمان بە گشتی بۆ بابای قورئان خوێن باس کرد و گوتمان دەبێ قورئان خوێن بەر لە خوێندنەوە یان لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا جێبەجێیان بکات و ئاگاداریان بێت، جا سەرەڕای ئەو ئادابانەی لە ڕابردوو باس کران کە ئەمانەی خوارەوەن:

1- دڵسۆزی و ئامادەکردنی نیەتێکی ساغ و ساف بۆ خوا

2- ڕێزگرتن و بە مەزن سەیرکردنی قورئان

3- بەتاڵ و خاڵی کردنی دڵ و دەروون و بیروهۆش لە سەرقاڵی و هەر کارێکی دونیا

4- پاککردنەوەی کەرستە و پێداویستیەکان

5- پاک و خاوێنی لەش

6- هەڵبژاردنی کاتێکی گونجاو

7- هەڵبژاردنی شوێنێکی گونجاو

8- هەڵبژاردنی شێوە دانیشتنێکی شایستە و ڕێک‌و پێک

9- ئەو کاتانەی پەسەند نیە قورئان بە دەنگ بخوێندرێ

10- مرۆڤی کافر نابێ لە بیستنی قورئان قەدەغە بکرێ

11- چاک خوێندنەوەی قورئان

12- خۆ بە خوا پەناگرتن

13- بە ناوی خوا دەست پێکردن

14- هێدی هێدی خوێندنەوەی قورئانی مەزن

15- دەنگ خۆشی لە قورئان خوێندن
16- ئایەتەکان و ووشەکانی قورئان؛ قورئان خوێن دەدوێنێ
17- رامان و ووردبوونەوە لە ئایەتەکانی قورئان
18- کەوتنە ژێر کاریگەری ئایەتەکانی قورئانی مەزن
19- گریان و فرمێسك ڕژاندن لە کاتی قورئان خوێندن
20- حوکمی گوتنی (صدق الله العظیم) چی یە؟
21- قورئان خوێن دەبێ خەتمی بەردەوامی هەبێ و نابێ هیجرەت لە قورئان بکات

چەند ئادابێکی تری تایبەت بە هەڵگرانی قورئان ماوە و پێویستە قورئان لەبەرەکان لەگەڵ ئەمانەی ڕابردوو ڕەچاوی بکەن و گرنگی پێبدەن کە ئەمانەی خوارەوەن:

**ئاداب و ڕەوشتی بیست و دوو:**

**لەسەر هەڵگرانی قورئان پێویستە پارێزی لە سەر زۆر خوێندنەوەی قورئانی مەزن بکەن و خەتمی بەردەوامیان هەبێت**

زۆر خوێندنەوەو خەتم کردنی قورئانی پڕ شکۆ سوننەتە، وە بۆ ئەوانەی قورئانی بە پیت و فەڕ و موبارەکیان لەبەرە پێویستە، وە لە پێغەمبەرمان محمد صلی الله علیه وسلم تا هاوەڵانی بەڕێزی و دوای ئەوانیش شوێن کەوتوانیان و تا ئەمڕۆ مسوڵمانانیش خەتم کردنی قورئانی ڕێ ڕۆشنکەرەوە بە یەکێك لە هەرە کارە گرنگەکان دەژمێرن و داکۆکی لە سەر دەکەن، وە کەمتەرخەمی لە خوێندنەوەیدا بە خاڵێکی لاواز هاتۆتە بەرچاویان و نیشانەی پرسیاری‌یان لەسەر ئەو کەسە داناوە.

بۆیە بۆ خەتم کردنی قورئانی بەرز و بڵند سێ (3) ڕاددەو ماوە دیاری دەکەین، کە پەیرەوکردنی هەریەك لەم سێ‌یە بۆ قورئان لەبەرەکان- یان

ئەوانەی چەند جزمێکیان لەبەرە - پێویستە، وە بۆ هەریەکەیان چەند نمونەیەك لە سیرە و ژیانی پێشینی چاکمان - ئەوەندەی لە ژیانییان دەستمان بکەوێ- دەهێنینەوە بەهیوای سوود وەرگرتن وچاو لێکردنیان:

**ڕادده و ماوەی یەکەم:** کەمترین ڕادده و ماوە بۆ قورئان خەتم کردن سێ ڕۆژە و بە لای زۆربەی زانایان ناپەسند (مکروه) بووە لە سێ (3) ڕۆژ کەمتر، چونکە لە سێ ڕۆژ کەمتر پەلەکردنە و لەوانەیە بۆ کەسانێك ماوەی تێگەیشتن و ووردبوونەوەی تێدا نەبێت.

لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: " من قرا القرآن في أقل من ثلاث لم يفقهه"[1].

واتە:" هەر کەسێك لە سێ (3) ڕۆژ کەمتر خەتمی قورئان بکات؛ لە واتاو مەبەستی ناگات".

ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ( وإنما ورد النهي عن قراءة القرآن في أقل من ثلاث على المداومة على ذلك، فأما في الأوقات المفضلة كمكة لمن دخلها من غير اهلها، فيستحب الإكثار فيها من تلاوة القرآن إغتناما للزمان والمكان، وهو قول احمد واسحاق وغيرهما من الائمة، وعليه يدلُّ عمل غيرهم كما سبق ذكره)[2].

واتە:( وە بێ گومان تەنها کاتێك قەدەغەکردنی خوێندنەوەو خەتم کردنی قورئان لە سێ (3) ڕۆژ کەمتر هاتووە ئەگەر ئەمە بەبەردەوامی بێ، بەڵام لە هێندێك کات و شوێنی بەڕێز وەکو مەککە بۆ ئەو کەسەی دەچێتە ناوی و خەڵکی مەککە نیە ئەوا بۆ قۆستنەوەی کات و شوێنەکە بەباش

(1) رواه البخاري معلقاً (1978)، وأبوداود (1390-1391)، وأحمد (158/2).

(2) لطائف المعارف لابن رجب الحنبلي (ص 191-192).

دادەنـرێ زۆر قورئـانی تێـدا بخـوێنرێ ، کـە ئەمـەش قـسەی ئەحمـەدو ئیـسحاق و غـەیری ئەوانیـشە لـە پێـشەوایان، وە کـردەوەی کەسـانێکی تریش بەڵگەیە لەسەر ئەمە وەکو لە پێشدا باس کرا ).

کەواتە جاروبارێك و لـە هەندێك کات و شوێنی تایبەت و بۆ هەندێك کەس حوکمێکی تری دەبێت، چونکە هەندێك کەس بە کەمتریش لـە سـێ (3) ڕۆژ دەتـوانن ڕامـان و ووردبوونـەوە لـە قورئـانی پایـەدار بکـەن بـۆ نموونە:

* عوثمـانی کـوڕی عـەففان* و تـەمیمی داری و سـەعیدی کـوڕی جوبـەیر و موجاهیـد و شـافعی و هێنـدێکی تـر جـاری وا هـەبوە بـە شـەووڕۆژێك خەتمێك بکەن[1].

* سولەیمی کوڕی عیتر- کە قازی بووە لـە سـەردەمی موعاویـەی کـوڕی ئـەبو سـوفیان- جـاری وا هـەبوە لەشـەووڕۆژێکدا قورئـانی خـەتم کردووە[2].

* لـە ئەبوحەنیفـە ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە کـە لـەو شـوێنەی وەفاتی کرد، حەوت (7) هەزار خەتمی تێدا کردبوو[3].

وەهەیانبووە لە سێ (3) ڕۆژ زیاتر خەتمی کردووە ، وەکو:

* عەلقەمـەی کـوڕی قـەیس ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ لـە هـەر پێـنج شـەودا خەتمێکی دەکرد[4].

---

* هەر یەك لەمانە جۆری تریشیان هەبووە لە خەتم کردنی قورئان.

(1) التبيان في آداب حملة القرآن للنووي (ص55).

(2) هەمان سەرچاوە.

(3) اقامة الحجة لمحمد عبدالحيّ اللكنوي (ص77).

(4) صفة الصفوة لابن الجوزي (17/3).

**ڕادده و مــــاوەی دووەم:** کــە بریتیـیــە لــە ڕاددەی ناوەنــدی، کــە هــەموو هەفتەیەك یان هەر دە (10) شەو جارێك خەتمێك بکەیت:

عن عبدالله بن عمرو رضـي اللـه عنهمـا قـال : كنـتُ أصـوم الـدهر واقـرا القرآن كل ليلة، قال: فاما ذكرت للنبي صلى الله عليه وسلم وأما أُرسَلَ الي فأتيته، فقال لي: "الم أخبر انك تصوم الدهر وتقرا القرآن كل ليلة؟ فقلت: بلى، يا نبي الله! ولم أرد بذلك الا الخير.

قال: "فان بحسبك أن تصوم من كل شهر ثلاثة ايام".

قلت: يا نبي الله، إني اطيق افضل من ذلك.

قال: "فإن لزوجك عليك حقا، ولزورك عليك حقا، ولجسدك عليك حقا".

قـال: "فـصم صـوم داود نـبي الله صـلى الله عليـه وسـلم فإنـه كـان اعبـد الناس".

قال: قلت: يا نبي الله! و ما صوم داود؟

قال: "كان يـصوم يومـاً و يفطـر يومـاً" قال: واقرا القرآن في كل شـهر". قـال: قلـت: يـا نـبي الله! إنـي اطيـق افـضل مـن ذلـك، قـال: "فـأقراه في كـل عشرين". قال: قلت: يا نبي الله! إني اطيق افضل من ذلك، قال: "فأقراه في كل عشر".

قـال: قلـت: يـا نـبي الله! إنـي أطيـق افـضل مـن ذلـك، قـال:"فـاقراه في كـل سـبع، و لا تـزد علـى ذلـك فـإن لزوجـك عليـك حقـاً، ولـزورك عليـك حقـاً، ولجسدك عليك حقاً".

قال: فشددت فشدد علي.

قال: وقال لي النبي صلى الله عليه وسلم: " إنك لا تدري لعلك يطول بك العمر".

قال: فـصرت الى الـذي قـال لـي الـنبي صـلى الله عليـه وسـلم فلمـا كـبرت

وددت اني كنتُ قبلت رخصة نبي الله صلى الله عليه وسلم [1].

واتـە: لـە عەبـدوڵڵای كـوڕی عـەمڕەوە خـوا لـە خـۆی و بـاوكی ڕازی بـێ دەگێڕنـەوە كـە گوتويـەتی: بـە درێـژايی سـاڵ بـەڕۆژوو دەبووم وە هـەموو شەوێكيش قورئانم خەتم دەكرد- واتـە لـە شـەونوێژ- جـا يـان ئـەوەبوو بـۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم م باس كرد، يان بە شوێنمدا ناردی، ئيدی هاتمە خزمەتی و پێی فەرمووم: "ئايا هـەواڵم نـەدراوەتیّ بە درێـژايی سـاڵ بە ڕۆژوودەبيت و هەموو شەوێكيش قورئان خەتم دەكەی"؟

گوتم: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا! بەمـەش جگـە لـە چاكە هيـچی تـرم نەويستووە.

فەرمووی:"ئەوەنـدەت بەسـە لـە هـەموو مانگێكدا سـێ (3) ڕۆژ بـەڕۆژوو بيت".

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! من توانام لەوە زياترە.

فـەرمووی: "هاوسـەرەكەت مـاڧ بەسـەرتەوە هەيـە، ميوانەكـەت مـاڧ بەسـەرتەوە هەيـە، لاشـەت مـاڧ بەسـەرتەوە هەيـە، جـا بـە شـێوەی ڕۆژوو گرتنی داود پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ ڕۆژوو بگرە كە ئەو لـە هـەموو كەسێك خواپەرست تر بووە"

گوتم ئەی پێغەمبەری خوا! ڕۆژووی داود چۆنە؟

فـەرمووی: ڕۆژ نـا ڕۆژێـك بـەڕۆژوو دەبـوو، وەمـانگی جارێـك خـەتمی قورئانيش بكە".

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من توانام لەوە زياترە.

فەرمووی: "هەموو بيست(20) ڕۆژ جارێك خەتمێك بكە".

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! توانام لەوە زياترە.

---

(1) رواه البخاري (1976-1979)، ومسلم (2722) واللفظ له.

فەرمووی:"هەموو هەفتەیەك خەتمێك بكە و لەوە زیاتر نەكەیت، چونكە هاوسەرەكەت ماڤی بەسەرتەوە هەیەو، میوانەكەت ماڤی بەسەرتەوە هەیەو، لاشەكەت ماڤی بەسەرتەوە هەیە"[1].

جا خۆم ئەمەم توند گرت بۆیە وا لەسەرم توونـد كـرا، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم پـێی فەرمووم: "تۆ نازانی لەوانەیە تەمەنت درێژ بێت".

تاوام بەسەر هات كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو بووم. جا كاتێك بە ساڵاچووم ئاواتم دەخواست مۆڵەتەكەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم م وەربگرتبوایە.

وەچەند نمونەیەكیش لە پێشینی چاكمان لە جێبەجێكردنی ئەم شێوەیە:

عوسمانی كوڕی عەففان و زەیدی كوڕی ثابت و عەبدوڵلای كوڕی مەسعودو ئوبەی كوڕی كەعب وعەبدولڕەحمانی كوڕی زەیدو عەلقەمەو ئیبراهیمی نەخەعی ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت لە هەفتەیەكدا خەتمێكیان كردووە[2].

---

(1) پاك و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە ئەم بەزەیی و ڕەحمەتەی لە پێغەمبەردا رواندوە و بۆ جیهان ڕەوانەی كردووە و ئێمەی لێ بێبەش نەكردووە... ئەوەتا ئاگادارمان دەكاتەوە بە جۆرێك لە خواپەرستیدا ڕوونەچین كە ببێتە هۆی نەدانی ماڤی خێزان و میوان و لاشە، وە لە هەمان كاتیشدا فێری ئەوەمان دەكات ناچالاك و كەمتەرخەم نەبین و بە ئەندازەی خۆی پشكمان هەبێ لە خواپەرستی. بەڵێ: پێغەمبەری خوا – صلی الله علیه وسلم– وەكو چۆن لە هەموو بوارەكان پسپۆر بووە؛ پسپۆری بواری كۆمەڵایەتیش بووە.

(2) التبیان في آداب حملة القرآن للنووي (ص58).

جا ئیمامی عوسمان ڕەزای خوای لێ بێ شەوی هەینی لە سوڕەتی (الفاتحة)ەوە دەستی پێ دەکرد بۆ سوڕەتی (المائدة)و شەوی شەممە لە (الأنعام)ەوە بۆ (هود)و شەوی یەکشەممە لە (یوسف)ەوە بۆ (مریم)و شەوی دووشەممە لە(طه)ەوە بۆ (طسم، موسی و فرعون)[1] و شەوی سێشەممە لە (العنكبوت)ەوە بۆ (ص~)و شەوی چوارشەممە لە (تنزيل)[2]ەوە بۆ (الرحمن)و شەوی پێنج شەممەش خەتمەکەی تەواو دەکرد.

وە هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش دابەشکردنێکی تری هەبوو بەڵام لەوەدا ڕێك بوو کە لە هەفتەیەك خەتمێك بکات.

**ڕاددەو ماوەی سێیەم:** کە دوورترین ماوەیە بۆ ئەو کەسانەی قورئانیان لەبەرە یان خەریکی لەبەرکردنی قورئانن، کە ئەویش لە هەر مانگێك وەیاخود چل(40) ڕۆژ خەتمێك بە بەردەوامی و بێ پچران، واتە ڕۆژانە بەلایەنی کەمی سەعاتێك بۆ پێداچوونەوەی قورئان تەرخان بکەن، ئەگەرنا دەبێتە هۆی لەبیرچوونەوەی قورئان. وەهەر کەسێك لە دوو مانگ جارێك قورئان مراجعە نەکاتەوە با جارێکی تر قورئان لەبەربکاتەوە.

**تێبینی:**

مرۆڤ سەر پشکە لە هەڵبژاردنی هەر یەك لەم سێ ڕاددانەی باسکرا، بەڵام ئەوەی تواناى زیاترە و ئیمانی بەهێزترە گومانی تێدانیيە ڕاددەی یەکەم یان دووەم هەڵدەبژێرێ.



---

(1) سورەتی (القصص).

(2) سورەتی (الزمر).

**ئاداب و ڕەوشتی بیست وسێ:**

**دەبێ پشکی شەوانەی لە قورئان خوێندن هەبێ**

**خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ٦﴾[1].

**واتە:(بەڕاستی شەوبێداریو گفتوگۆو پاڕانەوەو ڕازو نیاز لەگەڵ پەروەردگارا زۆر کاریگەرەو بۆ خوێندنەوەی قورئانیش لەبارو گونجاوترە ).**

**ئەمەش لەبەرئەوەی لەم کاتەدا جیهان هەمووی لە جم وجۆڵ و بزووتن کەوتووەو دڵ و دەروون حەساوەتەوەو بیرو زەین لە پەرش و بڵاوی خۆی کۆکردۆتەوەو دوورترە لە سەرقاڵی دونیاو بەرچاوی خەڵك، وەلە سەرووی هەمووشیانەوە پەروەردگاری بەبەزەیی لە سێیەکی کۆتایی شەو دادەبەزێتە ئاسمانی دونیاو بانگی بەندەکانی دەکات تا داوای پێویستی‌یەکانی دونیاو قیامەتی لێ بکەن.**

**جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە هەڵس و کەوت و ڕەفتارە جوانەکانی[2] و لە فەرمایشتە پیرۆزەکانی‌دا زۆر هانی داوین بۆ ئەوەی لە شەواندا لە خوێندنەوەی قورئانی مەزن- بە تایبەتی لە شەونوێژ- بێ‌ئاگا نەبین و بەردەوام پشکمان هەبێ:**

---

(1) سورة المزّمّل(6).

(2) عن أنس بن مالك -رضی الله عنه- قال: إن رسول الله وجد شیئا من وجع، فقیل له: یا رسول الله أشتد علیك الوجع، وإنا نرى أثر الوجع علیك. قال -صلی الله علیه وسلم- : "أما مع ما ترون، فقد قرأت البارحة السبع الطوال". أخلاق النبي وآدابه للأصبهاني (ص199)، وصحیح إبن حبان (320)، وصحیح ابن خزیمة (1073)، وشعب الایمان للبیهقي (2329)، ومسند أبي یعلى الموصلي (3350)، والمستدرك على الصحیحین للحاكم (1106).

لە تەميمى دارىيەوە ڕەزاى خواى لىٚ بێت كە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى: "من قرأ بمائة آية في ليلة كتب له قنوت ليلة"[1].

واتە: ( هەر كەسێك سەد (100) ئايەت لە شەودا بخوێنێ ئەوا ڕاوەستان و خواپەرستى شەوێكى بۆ نووسراوە).

موناوى ڕەحمەتى خواى لێ بێ دەڵێ: ((قنوت ليلة)) أي: عبادتها[2].

واتە: ( خواپەرستى شەو ).

لە عەبدوڵلاى كوڕى عەمرەوە ڕەزاى خوايان لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى: "من قام بعشر آيات لم يكتب من الغافلين، ومن قام بمائة آية كتب من القانتين، ومن قام بألف آية كتب من المقنطرين"[3].

واتە: (هەر كەسێك بە خوێندنەوەى دە (10) ئايەت لە شەونوێژ هەڵبستێتەوە لە بێئاگا و غافلان نانوسرێ، وە هەر كەسێك بە خوێندنەوەى سەد (100) ئايەت هەڵبستێتەوە لە ڕيزى ئەوانە دەنووسرێ كە فەرمانبەرى خوا دەكەن لە كاتى خۆشى و ناخۆشى، وە هەر كەسێك بە خوێندنەوەى هەزار (1000) ئايەت لە شەونوێژ هەڵبستێتەوە لە ڕيزى ئەوانە دەنووسرێ كە پاداشتيان بۆ چەندان قات زياد دەكرێ".

---

(1) أخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة (717)، وأحمد في المسند (103/4)، والطبراني في الكبير (1252)، وصححه الالباني في الصحيحة (644).

(2) فيض القدير شرح الجامع الصغير من أحاديث البشير النذير (255/6).

(3) رواه أبو داود (1398)، وابن حبان (إحسان-2572)، وابن السني في عمل اليوم والليلة (703)، وحسنه الالباني في الصحيحة (642).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:" الصيام والقرآن يشفعان للعبد يوم القيامة، يقول الصيام: أي رب منعته الطعام و الشراب بالنهار فشفّعني فيه، ويقول القرآن: منعته النوم بالليل فشفعني فيه" قال:"فيشفعان"[1].

واتە: " لەڕۆژی دوایی ڕۆژوو و قورئان دەبنە تکاکار بۆ بەندە، ڕۆژوو دەڵێ: پەروەردگارا من خواردن و خواردنەوەم لەڕۆژدا لێ قەدەغە کردبوو، جامنی بۆ بکە تکاکار، وەقورئانیش دەڵێ: من نووستنم بەشەو لێ قەدەغە کردبوو، جامنی بۆ بکە تکاکار، دەفەرموێت: ئیدی دەبنە تکاکار".

کەواتە: هەرکەسێك حەز دەکا قورئان ببێتە تکاکاری با شەوانە شەونوێژی هەبێ و قورئانی زۆری تێدا بخوێنێ.

تەنانەت یەکێك لە هۆکارەکان کە لەبیرچوونەوەی قورئانی مەزن ناهێڵێ- کە کێشەی سەرەکی قورئان لەبەرەکانە- بریتییە لە خوێندنەوەو هەبوونی پشکی شەوانە و ڕۆژانە لە قورئان، وەکو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: "وإذا قام صاحب القرآن فقرأه بالليل والنهار ذكره، وإذا لم يقم به نسيه"[2].

واتە :" وەئەگەرخاوەنی قورئان بە شەوو ڕۆژ لە نوێژدا بۆی هەستاوە دێتەوە بیری، وە ئەگەر بۆی هەڵنەستاوە لەبیری دەچێتەوە"

کەواتە دەبێ هاوڕێ و هەڵگرانی قورئان پشك و بەشی بەردەوامیان هەبێ لە شەو و ڕۆژ.

---

(1) رواه أحمد (174/2)، والطبراني في الكبير (88)، وابن نصر في قيام الليل (ص23) . والحاكم(554/1) وقال: (على شرط مسلم)، ووافقه الذهبي، أنظر صحيح الجامع للألباني (3882).

(2) رواه مسلم (789).

**ئاداب و ڕەوشتی بیست و چوار:**

**هەر قورئان لەبەرێك شەونوێژو ویردی تایبەتی هەیە لە قورئان خوێندن- وەکو لە ئادابی ڕابردوو باسمان کرد- جا ئەگەر شەوێك لە شەوان لەبەر زۆر ماندوویەتی یان خەو بۆ هاتن وەیاخود نەخۆشی ویردەکەی بۆ تەواو نەکرا یان نەیخوێند دەتوانێ بۆ بەیانی لە نێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆ نوێژەکانی بکاو ویردەکەی تێدا بخوێنێتەوە**

**عن عبدالرحمن بن عبدالقاريء قال: سمعت عمر بن الخطاب رضي الله عنه يقول : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: "من نام عن حزبه، أو عن شيء منه فقرأه فيما بين صلاة الفجر و صلاة الظهر كتب له كأنما قرأه من الليل"**[1].

**واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: " هەر کەسێك لە پشك و بەشی شەوانەی لە خوێندنەوەی قورئان بخەوێ، یان لە بەشێکی بخەوێ و نەیخوێنێ جا لە نێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆ بیگێڕێتەوەو بیخوێنێتەوە وای بۆ دەنوسرێ هەروەکو بڵێی لەشەودا خوێندبێتییەوە".**

**حافزی عێراقی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ:( وهل المراد به – أي الحزب – صلاة الليل اوقراءة القرآن في صلاة اوغير صلاة، يحْتملُ كلا من الامرين )**[2].

**واتە:( ئایا مەبەست لە حیزب شەونوێژە یان خوێندنەوەی قورئانە لەنوێژ یاخود لەغیری نوێژ، لەوانەیە هەردووکیان بێ ).**

---

(1) رواه مسلم (747).

(2) تحفة الأحوذي شرح السنن الترمذي (118/2).

ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: (کان لمحمد بن سيرين سبعة أوراد يقرؤها بالليل، فاذا فاته منها شيء قراه من النهار"[1].

واته:"موحەممەدی کوڕی سیرین ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەشەودا حەوت (7) ویردی هەبوو؛ هەر حەوتی دەخوێندەوە، جا ئەگەر بەشێکی لەمانە لێ بفەوتابوایە لە ڕۆژدا دەیخوێندەوە".

**ئاداب‌و ڕەوشتی بیست و پێنج:**

**وریا بوون لە لەبیرچوونەوەی قورئانی پایەدار**

لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ڕەزای خوای لێ بێ لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم کە فەرموویەتی:" تعاهدوا هذا القرآن، فوالذي نفس محمد بيده لهو أشد تفلتاً من الابل في عقلها"[2].

واته: "پەیمان لەگەڵ قورئان ببەستن و بەردەوام دەوری بکەنەوە، وە سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە! قورئان زووتر دەڕوا و لەبیردەچێتەوە لە وشترێك کاتێك لە پەتەکەی بەردەبێ و دەڕوا".

عن عبدالله عمر بن الخطاب رضي الله عنهما أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال:" إنما مثل صاحب القرآن كمثل صاحب الابل المعلقة إن عاهد عليها أمسكها، وأن اطلقها ذهبت"[3].

وزاد المسلم:"وإذا قام صاحب القرآن فقراه بالليل والنهار ذكره وإذا لم يقم به نسيه"[4].

---

(1) صفة الصفوة لابن الجوزي (165/3).

(2) رواه مسلم (791)، والبخاري بلفظ: "أشد تفصّيا" (5033).

(3) رواه البخاري (5031).

(4) رواه مسلم (789).

واتـە: "بەڕاسـتی نموونـەی خـاوەنی قورئـان- قورئـان لەبـەر- وەکـو نموونەی خاوەنی ووشتری بەستراوە وایە، ئەگەر بیبەستێتەوە لەدەستی دەرناچیٚ، وە ئەگەر نەیبەستێتەوە دەڕوات".

وە لە ڕیوایەتی موسلیم دا: "وە هەر کاتێك خاوەنی قورئان بە شەو و ڕۆژ هەسـتا و خوێندیـیەوە ئـەوا دێتـەوە یـادی، ئەگـەر نـا لـە بـیری دەچێتەوە".

عن عبدالله بن مسعود رضـي الله عنـه قـال: قـال الـنبي صلى الله عليـه وسلم: "بئس مـا لاحـدهم أن يقـول: نيسـت آيـة كيـت وكيـت، بـل نُـسّي، واستذكروا القرآن، فأنه اشد تَفَصّياً من صدور الرجال من النعم"[1].

ومسلم بلفظ: "بئس لاحدكم" و "بل هو نسي"[2].

واتـە: لـە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لـیٚ بـیٚ پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: "بۆ کەسێك چەند خراپ و ناشیرینە بڵـیٚ: مـن ئـەو ئایەتـەم لەبیرچۆتەوە، بەڵکو لـە بیری براوەتـەوە، قورئـان بـە بـیری خۆتـان بهێننــەوە و دەوری بکەنـەوە، چـونکە لـە ووشـتر خێراتـر لـە سینەی پیاوان دەڕوا و دەردەچێت".



(1) رواه البخاري (5032).

(2) رواه البخاري (790).

**ئاداب و ڕەوشتی بیست و شەشەم:**

## پەیوەست بوون بە فەرمانبەری خوا و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و خۆپاراستن لە گوناه و تاوان

**وسئل الامام مالك رحمه الله: ( هل يصلح لهذا الحفظ شيء؟ فقال: إن كان شيء فترك المعاصي )[1].**

**واتە: پرسیارکرا لە مالیکی کوڕی ئەنەس ڕەحمەتی خوای لێ بێ: (ئایا هیچ کارێك هەیە بۆ لەبەرکردن باش بێ ؟**

**فەرمووی: ئەگەر هەبێ ئەوا وازهێنانە لە گوناه و تاوان).**

**زەححاکی کوڕی موزاحیم ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ( ما من احد تعلم القرآن فنسيه إلا بذنب يحدثه لأن الله تعالى يقول: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠ ﴾[2] وان نسيان القرآن من أعظم المصائب")[3].**

**واتە: "هەر کەسێك قوڕئانی لەبەرکردبێ و لەبیری چوبێتەوە ئیلا بە هۆی ئەنجامدانی گوناهێکەوە دەبێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠ ﴾. جا بێگومان لەبیرچوونەوەی قوڕئانیش گەورەترین کارەساتە).**

---

(1) جزء فيه أخبار لحفظ القرآن تخريج ابن عساكر، نقلاً من كتاب: كيف تحفظ القرآن الكريم ليحى الغوثاني (ص69)..

(2) سورة الشورى (30).

(3) أخرجه أبو عبيد في الفضائل (ص104) وفي غريب الحديث (145/1)، وابن مبارك (85)، ووكيع(95) كلاهما في الزهد، والبيهقي في الشعب(1813)، وابن كثير في تفسير هذه الاية، وسنده جيد.

**ئاداب و ڕەوشتی بیست و حەوتەم:**

**قورئان لەبەرەکان دەبێ پێداچوونەوەی بەردەوامی قورئانی مەزنیان هەبێ**

ئەگەر خوای بەخشەر بە لەبەرکردنی قورئانی مەزن ڕێزداری کردی و ئەم بەخششە گەورەیەی پێ بەخشی و ئەم ئەمانەتە نایابەی پێ ڕەوا بینی ئەوا بزانە کە تۆ ئەمڕۆ جیای لە دوێنێ، ئەمڕۆ خەڵات و نیعمەتی زیاترو نورو حیکمەتی گەورەی خواییت پێ بەخشراوەو ئەرکی زیاترت لەسەر شان دانراوە، بۆیە دەبێ هەموو هەوڵ و توانات بخەیتە کار بۆ لە دەست نەدانی ئەم خەڵاتە مەزنە. چونکە خوای گەورە سروشتی مرۆڤی وا دروست کردووە کە بتوانێ قورئان لەبەر بکات بەڵام لەبیریشی ببرێتەوە، جا ئەم لەبیرکردنە بەهۆی سەرقاڵی و زۆرکاری بێ یان بەهۆی کەم پێداچوونەوەو کەمتەرخەمی بێ، وەیاخود گوناه و سەرپێچی کردنی خوای گەورە بێ، بۆیە ئیمانداری خەمخۆر بۆ قیامەتی خۆی ڕەچاوی پێداچوونەوەیەکی ڕێکوپێکی قورئان دەکاو ناهێڵێ لە یادی بچێتەوەو وریا دەبێ لە کەمتەرخەمی و پێداچوونەوەی کەم بەڵکو بەردەوام بەپێی بەرنامەیەکی دوورو ڕێکوپێک بە قورئانی بەڕێز دادەچێتەوەو دەیهێنێتەوە یادی. وەهەرگیز ئەم چەند ئامۆژگاری و ئاگاداریەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە فەرموودە شیرینەکانی لە یاد ناچێ کە لە ڕابردوو هێندێکمان لێ باس کرد، وەیەکێک لەوانە:

کە فەرموویەتی: "تعملوا كتاب الله وتعاهدوا وتغنوا به، فوالذي نفسي بيده، لهو أشد تفلتاً من المخاض في العقل"[1].

---

(1) رواه أحمد (146/4)، والنسائي في الفضائل (60)، والدارمي (316/2)، وابن نصر في قيام الليل (ص140)، وابن حبان (1788)، والفريابي في فضائل القرآن (162-163)، وابن أبي شيبة (500/2)، والطبراني في الكبير (801/17)، والبيهقي في الشعب (1815) وسنده صحيح.

واتە: "کتێبی خوا فێربن و لەبەری بکەن و پەیمانی لەگەڵ ببەستن و بە دەنگەکانتان بیلاوێننەوە، وە سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە قورئان زۆر خێراتر دەڕوا و لەبیردەچێتەوە- ئەگەر پێداچوونەوەی بەردەوامی نەکەن- لە ووشترێکی دووگیانی بەستراوە".

قال المناوي:(تعلموا كتاب الله): القرآن أي احفظوه وتفهموه.[1].

واتە: موناوی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (تعلموا): لەبەری بکەن و شارەزای بن.

وەزانایانیشمان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ڕۆڵی پێداچوونەوەیان زانیوەو بۆیە لەبەر گرنگی‌یەکەی کتێبیان لەبارە داناوەو تێبینی گرنگی‌یان نووسیوەو قسەی نەستەقی جوانیان گوتووە، بۆ نمونە:

ئیمام جەعفەری صادق ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: "القلوب ترب، والعلم غرسها، والمذاكرة ماؤها، فاذا انقطع عن الترب ماؤها جف غرسها"[2].

واتە: ( دڵەکان وەکو خۆڵ و زەوی وان، وە زانست و زانیاریش چێنراوەکەیەتی، بەبیرهێنانەوە و یادکردنەوەش ئاوەکەیەتی، جا هەرکاتێك ئاودانەکە بۆ زەوی‌یەکە نەما، چێنراوەکە ووشك دەبێت ).

زوهری ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە بە هەشتا(80) ڕۆژ هەموو قورئانی لەبەرکردووە دەڵێ: (إنما يذهب العلم النسيان وقلة المذاكرة)[3].

واتە: ( بێگومان ئەوەی کە زانست ناهێڵێ و بەرەو نەمانی دەبات: لەبیرچوون و کەم پێداچوونەوەیە).



(1) فيض القدير شرح الجامع الصغير من أحاديث البشير النذير (336/3).

(2) الحث على حفظ الحديث للخطيب البغدادي (ص200).

(3) رواه ابن عدى في الكامل في الضعفاء (59/1)، وابن عبدالبر في (جامع بيان العلم (108/1).

وسئل ابن تيمية رحمه الله:( عن رجل يتلو القرآن مخافة النسيان ورجاء الثواب، فهل يؤجر على قراءته للدراسة ومخافة النسيان أم لا؟ وقد ذكر رجل ممن ينسب الى العلم أن القاريء إذا قرأ للدراسة مخافة النسيان انه لا يؤجر، فهل قوله صحيح أم لا؟

الجواب: بل إذا قرأ القرآن لله تعالى فانه يُثاب على ذلك بكل حال، ولو قصد لقراءته أنه يقرؤه لئلا ينساه)[1].

واتە:( لە ئیبنو تەیمیە -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- پرسیارکرا: دەربارەی پیاوێك كە لە ترسی لەبیرچوونەوە و بەهیوای پاداشت وەرگرتن لە خوا قورئان دەخوێنێتەوە، جا ئایا پاداشت لەسەر خوێندنەوەكەی وەردەگرێ كە بۆ دیراسە و لەترسی لەبیر چوونەوەیە یان نا؟ چونكە بەڕاستی لە پیاوێك دەگێڕنەوە كە بەدەمی یەكێك لەوانەی زانایە گوتویەتی، قورئان خوێن ئەگەر خوێندنەوەكەی بۆ دیراسە و لەترسی لەبیرچوونەوە بێ پاداشت وەرناگرێ، جا ئایا ئەمە ڕاستە یان نا؟

وەڵام: بەڵكو ئەگەر خوێندنەوەی قورئان بۆ خوا بێ ئەوا بێ گومان بە هەموو بارێك پاداشت لەلای خوا لەسەر ئەمە وەردەگرێ، هەتا ئەگەر لەخوێندنەوەكەیدا ئامانجی ئەوەبێ تا لەبیری نەچێتەوە).



(1) مجموع الفتاوى لابن تيمية (229/13).

# بەشی حەوتەم

## پێداچوونەوە و دەورکردنەوەی قورئان

بە ڕاستی پێداچوونەوە و دەورکردنەوەی قورئان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بەپێی هێزو تواناو ئیمانی کەسەکە دەگۆڕێ، وە هەروەها چەندان ڕێگاو شێوازی جۆراو جۆر هەن بۆ ئەم پێداچوونەوەیە. بە شێوەیەکی گشتی شێوازی پێداچوونەوە (مراجعە) یان تاکی (فردی)یە یان دووانی(ثنائي)یە، وە دەکرێ هەردووکیان بەیەکەوە جێبەجێ بکرێن.

**پێداچوونەوەی تاکی:**

لەم پێداچوونەوەیەدا بابای قورئان لەبەر دوای پشت بەستن بە خوای گەورە لەسەر پێی خۆی دەوەستێ و بەپێی بۆ لوان و سەرقاڵی بەرنامەیەك بۆ خۆی دادەنێ و یەکێك لەم شێوازو ڕێگایانەی باسیان دەکەین -جگە لە شێوازی حەوتەم- دەکاتە یاسایەك بۆ خۆی و پەیڕەوی دەکات و دەست بەرداری نابێت:

**وێنە و شێوازی یەکەم:** ئەمەیان چاکترین و بەرزترینیانە و لە چڵە پۆپەیەتی، کە مرۆڤ بتوانێ ڕۆژانە بە پێنج جزمی قورئان دا بچێتەوە، بۆیە گوتراوە: (من قرأ الخمس لم ينس).

واتە: " هەر کەسێك ڕۆژانە پێنج جزم لە قورئان بخوێنێ لەبیری ناچی".

**وێنە و شێوازی دووەم:** ئەمەیان ناونراوە بە (حەوت کردنی قورئان). واتە: بەش بەش کردنی قورئان بۆ حەوت پارچە و خەتم کردنی لە یەك هەفتە.

ئیبنو جەماعە ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ( وقراءة القرآن في كل سبعة ايام ورد حسن، ورد في الحديث وعمل به احمد بن حنبل)[1].

واتە:( خوێندنەوەی هەموو قورئان لە هەر حەوت(7) ڕۆژێکدا ویردێکی چاکە، ئەم کارە لە فەرموودەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دا هاتووەو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش کاری پێ کردووە).

دابەش کردنەکەش بەم شێوەیەیە:

1-شەوی هەینی لە سوڕەتی (الفاتحة)ەوە بۆ کۆتایی‌سوڕەتی (المائدة).

2- شەوی شەممە لە (الأنعام)ەوە بۆ (هود) .

3- شەوی یەکشەممە لە (یوسف)ەوە بۆ (مريم) .

4-شەوی دووشەممە لە (طه)ەوە بۆ (طسم، موسى و فرعون)[2] .

5-شەوی سێشەممە لە (العنكبوت)ەوە بۆ (ص~) .

6- شەوی چوارشەممە لە (تنزيل)[3]ەوە بۆ (الرحمن) .

7-شەوی پێنج شەممەش خەتمەکەی تەواو دەکرد.

وێنە و شێوازی سێیەم: ڕۆژانە بە سێ(3) جزمی قورئان دا بچێتەوە، واتە لە مانگێکدا سێ(3) خەتم بکات.

وێنە و شێوازی چوارەم: ڕۆژانە بە جزمو نوێکی قورئان دا بچێتەوە، واتە لە هەر بیست (20) ڕۆژ خەتمێك بکات.



(1) تذكرة السامع والمتكلم لابن جماعة (ص22).

(2) سوڕەتی (القصص).

(3) سوڕەتی (الزمر).

**وێنە و شێوازی پێنجەم:** ڕۆژانە بە جزمێکی قورئان دا بچێتەوە، واتە لە هەر مانگێک خەتمێك بکات، وە پێویستە قورئان لەبەرەکان بەهیچ شێوەیەك لەم پلەیە دانەبەزن.

**وێنەو شێوازی شەشەم:** پێداچوونەوە لە نوێژە سوننەتەکان: هەر یەکێك لە ئێمە لە نوێژە سوننەتەکانیدا- ئەگەر تەنها سوننەتە ڕاتبەکان حساب بکەین کە (10 تا 12) ڕکاتن- لەجیاتی ئەوەی سوڕەتە کورتەکانی تێدا بخوێنین بەڵکو بە پێی بەرنامەیەکی ڕێكوپێك نیو لاپەڕە بخوێنین- کە نزیکەی هەشت (8) دێر دەکات- ئەوا تەنها لە نوێژە ڕاتبەکان نیو جزم مراجعە دەکەینەوە، ئەمە جگە لە نوێژی چێشتەنگاو و شەونوێژ و سوننەتەکانی تر، خوای گەورە یارمەتی هەموو لایەکمان بدات.

**وێنە و شێوازی حەوتەم:** ئەمەش بە بەکارهێنانی کاسێتی قورئانی تۆمارکراو بە دەنگی قورئان خوێنێکی خۆش و ڕێكوڕەوان، جا چ بەهەڵگرتنی کاسێتەکان لە ئۆتۆمبیل و گوێ لێگرتنیان لە کاتی چوون بۆ سەر کار و هاتنەوە، یان بەهۆی تەسجیلێك یا هەر ئامێرێکی ترو گوێ لێگرتنیان لە هەر کاتو شوێنێکی تری لەبار و گونجاو.

**تێبینی:**

1- شێوازی حەوتەم وەکو یارمەتیو پاڵپشتییەك لەگەڵ یەك لە پێنج (5) شێوازەکەی یەکەم پیادەدەکرێ نەك بە تەنها. چونکە بۆ پێداچوونەوە سوودی تەواو نابەخشێ.

2- پێداچوونەوەکە دەبێ لەبەربێ نەوەکو لەسەر موصحەف.

**پێداچوونەوەی دووانی:**

ئـەم جـۆرە پێداچـوونەوەیە لـە نێـوان دوو کـەس یـان زیـاتر بـە پێـی بەرنامەیەکی دیاریکراوی ڕۆژانە یان هەفتانە یان زیاتر ئەنجام دەدرێ.

عن فاطمة بنت محمد صلى الله عليه وسلم قالت أسر الي النبي صلى الله عليه وسلم:"ان جبريل كان يعارضني بالقرآن كل سنة، وانه عارضني العام مرتين، ولا أراه إلا حضر أجلي"[1].

واتـە: لـە فاتیمـەی کـچی پێغەمبـەر محمـد صـلى الله عليـه وسـلم دەڵـێ: پێغەمبـەر صـلى الله عليـه وسـلم بـە پـەنهانی پێـی فـەرمووم:" کـە جبریـل سـەلامی خـوای لـێ بـێ هـەموو سـاڵێك جارێك قورئـانی گـوێ لـێ گرتـووم، ئەمساڵ دووجار گوێی لێ گرتووم، واتێدەگەم کە ئەجەلم ئامادەبووە".

**تێبینی:** لە فەرمایشتەکەدا دیارە کە لای دووەم جبریل بووە، بۆیـە دەبێ پێداچوونەوەکە لـەلای مامۆسـتایەکی قورئـان لەبـەرو لێـزان و پـسپۆر بـێ، تاوەکو چاودێری کرداری لەبـەرکردن و پێداچوونەوەی لەبەرکراوەکـەی بۆ بکات، بەڵام لە کاتی ناچاریو نەبوونی مامۆستای پسپۆرو قورئـان لەبـەر لەگەڵ هەر کەسێکی تری شیاو و قورئان ڕەوان ئاسایییەو دەبێ.



---

(1) رواه البخاري: باب/ كان جبريل يعرض القرآن على النبي صلى الله عليه وسلم.

## بەشی هەشتەم

# ئەو خواردن و خواردنەوانەی بیروهۆش بەهێز دەکەن و یارمەتی درەنگ لەبیرچوونەوە دەدەن

بەڕاستی خوای گەورە نیعمەتی زۆرو گەورەی بە ئێمەی مرۆڤ بەخشیوە، جا یەکێك لەو نیعمەتە گەورە و مەزنانە بریتیە لە زەین و هۆش، ئەو بیروهۆشەی کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا هەرچی بمانەوێ بە وێنەو دەنگ و ڕەنگەوە بۆ سوود و کەڵکی خۆمان تێیدا تۆمار دەکەین و هەڵی دەگرین، ئەمە سوپاسگوزاری پێویستە. یەکێك لە نیشانەکانی سوپاسگوزاریش ئەوەیە کە ئێمە زەین و بیروهۆشمان لە کاری چاك بەکاربهێنین.

بیروهۆش و مێشکیش وەکو باقی ئەندامەکانی تری لەش بەڵکو زیاتریش پێویستی بە خزمەت و خواردن و پاراستن هەیە، بە تایبەتی کاتێك دەمانەوێ بیروهۆشمان بۆ خزمەت و لەبەرکردنی قورئان بەکاربهێنین.

جا ئێمە – إن شاء الله– هێندێك لەو خواردن و خواردنەوانە دەخەینە ڕوو کە سوود و کەڵکێکی زۆر بە مێشك دەگەیەنن و بیروهۆش بۆ لەبەرکردن چالاك دەکەن:

1– هەنگوین: بە دەقی ئایەتی قورئانی مەزن شیفای بۆ خەڵکی تێدایە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِّلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[1].

---

(1) سورة النحل (69).

واتە:(( لەوەو دوا فێرمان کردووە کە لە هەموو بەروبووم و- شیلەی گوڵان و شتی بەسوود - بخوات و پێمان ڕاگەیاندووە ئەو نەخشانەی کە پەروەردگارت بۆی کێشاویت بە ملکەچییەوە ئەنجامی بدە - لە دروست کردنی شانە و مژینی شیلە و دروست کردنی هەنگوین و پوورەدان بە دەوری شاژنداو بەخێوکردنی گەراکان... هتد- جا لە ناوسکی ئەو هەنگانەوە شلەیەکی ڕەنگ جیاواز دێتەدەرەوە کە- سەرەڕای تامی شیرین و خۆشی- شیفای تێدایە بۆ خەڵکی، بەڕاستی ئا لەمەشدا بەڵگەو نیشانەی بەهێز هەیە بۆ کەسانێك بیر بکەنەوە)).

**وەهەندێك لە پێکهاتەکانی هەنگوین ئەمانەن:**

شەکری فرەکتۆز (Fructose) و شەکری گلوکۆز (Glucose)، وەلە ڤیتامینەکانیش ڤیتامین: ثیامین($B_1$)، ڕایبۆفلاڤین ($B_2$)، نیاسین ($B_3$)، پایریدۆکسین ($B_6$)، سیانۆکۆبالەمین ($B_{12}$)و، (K)و، (A) و (E)، وەلە کانزایەکانیش: کانزای کالیسیۆم و سۆدیۆم و پۆتاسیۆم و گۆگردو یۆدو مەنگەنیزو ئاسن و کلۆر ... هتد.

بۆیە هێندێك لە پزیشکان وەسفێکی جوانی هەنگوینیان کردووە و گوتویانە: ( المنجم من الدواء). واتە: (کارگەیەك لە داو دەرمان).

زوهری ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: "عليك بالعسل فأنه جيد للحفظ"[1].

واتە: ( دەست بە هەنگوین بگرەو بەردەوام لێی بخۆ. چونکە بۆ لەبەرکردن باشە ).



وەهەروەها ئەگەر بڕێك لە هەنگوین و چەند دڵۆپێك لە زەیتی ڕەشکە یان دەنکەکەی تێکەڵ بکرێ و ماوە ماوە بەم شێوەیە لێی بخورێ زۆر

---

(1) الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع للخطيب البغدادي (217/2).

باشە بۆ چاککردنی دەنگ و نەهێشتنی بەڵغەم و بەهێزکردنی بیروهۆش.

2- زەیتون و زەیتەکەی.

3- خورما و جۆرەکانی.

4- ترێ ی ڕەش و بەرهەمەکانی:

ا- ترێ ی ڕەش: خواردنی ترێ ی ڕەش زۆر بە کەڵکە بۆ مێشك و بیروهۆش، ئەمەش لەبەر بوونی بڕێکی زۆر لە شەکری گلوکۆز تێیدا، کە ئەم شەکرە بریتییە لە خواردنی سەرەکی مێشك، ترێ ی ڕەشیش نزیکەی (90٪)ی ئاوو (7٪) شەکری گلۆگۆزو (3٪)ی ماددەکانی ترە، واتە لە یەك کیلۆگرام ترێ ی ڕەش حەفتا(70) گرام شەکری گلوکۆزی تێدایە کە ڕێژەیەکی زۆرە، بۆیە زۆر گرنگی بە خواردنی بدەن.

ب- مێوژی ڕەش: لە سێ باردا سوودی لێ وەردەگیرێ:

باری یەکەم: ووشکەو دەتوانرێ لە گیرفاندا هەڵبگیرێ و لەسەردان و سەفەر لە جیاتی گوڵەبەڕۆژە بخورێ.

باری دووەم: لە کاتی نەبوونی یان گران بوونی ترێ ی ڕەش، وەکو لە وەرزی زستان.

باری سێیەم: دەتوانرێ بکرێتە شەربەت[1] و خۆشاوو بخورێتەوە، کە ئەمەش لەزەت و تام و بۆیەکی تر وەردەگرێ و سەرو دڵ زیاتر حەزی پێ دەکات.

---

(1) یەك کیلۆ مێوژی ڕەش ئەگەر بە خەستی بکرێتە شەربەت زیاتر لە (3) لتر شەربەتی دەکەوێتێ، بۆیە: أ- هەم کارێکی ئابوورییە کە تۆ لە جەژن و بۆنەکان لە جیاتی شەربەتی بازاڕ بۆ خۆت لە ماڵەوە شەربەت لە مێوژ دروست بکەی کە نرخەکەی هەرزانتر دەوەستێ. ب- وەهەم لە ڕووی تەندروستییەوە بۆ خۆت و خاووخێزان و میوانەکانت سەلامەتە، چونکە شەربەتەکانی بازاڕ وەکو بیبسی و فانتاو ئەوانی تر هۆیەکن بۆ دروست بوونی شێرپەنجەو نەخۆشییەکانی کۆلۆن و گەدەو گورچیلە.

هاشمی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: "من احب ان يحفظ الحديث فليأكل الزبيب"[1].

واتە: (هەر کەسێك پێی خۆشە فەرموودە لەبەر بکات با مێوژ بخوات).

ج- دۆشاوی ترێی ڕەش.

*ئەزموونی تایبەتی*

من بۆ خۆم زۆر گرنگی بە مێوژ و دۆشاوی ترێ دەدەم و زۆریان لێ دەخۆم. وە سوودێکی زۆریان پێ گەیاندووم بۆ کرداری لەبەرکردن، تەنانەت ئەو کاتانەی خەریکی لەبەرکردنی قورئانی بەڕێز بووم سەرەڕای دۆشاوی ترێ، دوای هەموو عەسرێك چەنگێکم لە مێوژی ڕەش دەخوارد، وەئەگەر سەر و دڵت خواردنی مێوژی نەبرد دەتوانی خۆشاوی لێ دروست بکەی، بەوەی هێندێك مێوژ دوای سەروکلك کردنی بۆ ماوەی بیست و چوار (24) سەعات بکەیتە ئاوەوە و لە بەفرگرە هەڵیگری و دوایی لێی بخۆی و بخۆیتەوە.

5- ئاوی زەمزەم: لە کاتی خواردنەوەیدا هەر نیاز و نیەتێکت هەبێ خوای گەورە بۆ ئەوە سوودت پێ دەگەیەنێ. وەکو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: " ماءُ زمزم لما شُرب لهُ "[2].

ئیدی بەم ئەندازەیە هیواداریین توانیبێتمان خزمەتێك بە بیروهۆشتان پێشکەش بکەین، تا ئێوەش ئامادەبن بە کاری بهێنن بۆ شارەزابوون لە شەریعەتی خواو لەبەرکردنی قورئان.

---

(1) الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع للخطيب البغدادي (217/2).

(2) صحيح لشواهده، صحيح الجامع للألباني (5502).

## بەشی نۆیەم

# خوێندنەوەو خەتم کردنی قورئان لە مانگی ڕەمەزان

خــوای گــەورە دەفــەرموێ:﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ١٨٥ ﴾[1].

واتــە:( مــانگی ڕەمــەزان – ئــەو مانگەیــە- کــە قورئــانی تێــدا هاتۆتــە خوارەوە، لە کاتێکدا ئەم قورئانە ڕێنموونی بەخشە بە خەڵکی و بەڵگەی زۆری تێدایــە، لــە ڕێنمــوونی و جیاکردنــەوەی ڕاســت و ناڕاســتو حــەقو ناحــەق. جــا هــەر کەسێك لــە ئێــوە گەیــشتە ئــەو مانگــە دەبــا ئــەو مانگــە بەڕۆژوو بێت، ئەوەش کە نەخۆش بێت یــان لــە سەفەردا بــێ بــا لــە ڕۆژانــی تــردا بــەو ئەندازە بیگێڕێتــەوە، چونکە خوا ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێــتو نایــەوێت – پەرســتنو فــەرزەکانتان- لەســەر قــورس و گــران بکــاتو بــۆ ئــەوەی ئــەو مــاوە دیــاریکراوە تــەواو بکــەنو خــوا بــە گــەورە بگــرنو سوپاسگوزاریشی بکەن لەسەر ئەوەی کە ڕێنموونی کردوون )).

ئەگــەر ســەرنج بــدەین خوێندنــەوەو خــەتم کردنــی قورئــان – وەکــو لــە هەندێك لە بابەتەکانی ڕابردوو باس کرا- لە هەموو کاتو ساتێکی ژیانی پێشینی چاکمان بە گرنگ لەبەرچاو گیراوە. بەڵام لە مانگی ڕەمەزان زیاتر. ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك:

---

(1) سورة البقرة (185).

## ...کردنی قورئانی مەزن

**هـۆی یەکـەم:** سـەرەتای دابـەزین و ڕەوانـەکردنی قورئـانی بـەرزو پـاك لـە مانگی ڕەمەزان بوو، ئەمەش ئەو شەوەی جبریل سەلامی خوای لیٚ بیٚ لە لایەن خوای بالآدەست و بە توانا بۆ لای پێغەمبەرمان محمد صلی الله علیه وسلم هات و بۆ یەکەم جار ئەم چەند ئایەتە موبارەکەی بۆ خوێندەوە، کە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥) ﴾[1].

**هـــۆی دووەم:** هـەر لـە مـانگی ڕەمەزانـدا بـوو قورئـانی مـەزن لـە ( لـوح المحفـوظ ) بـە یـەك کـەڕەت بـۆ ئاسمـانی دونیـا دابـەزی، ئینجا لەوێشەوە بەش بەش و بـە ئەندازەی پێویـست لـە مـاوەی بیـست و سـیٚ (23) سـالٚ و چەند مانگێك هەمووی دابەزی.

**هۆی سێیەم:** پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ خۆی لە مانگی ڕەمەزاندا زۆر گرنگی بە خوێندنەوەو دیراسەکردنی قورئان دەدا. تەنانەت جبریلیش سلاوی خوای لیٚ بیٚ دەهاتە لای و سەرپەرشتی و هاوکاری دەکرد.

لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بیٚ دەلٚیٚ: "کان رسول الله صلى الله عليه وسلم أجود الناس، وكان أجود ما يكون في رمضان حين يلقاه جبريل، وكان يلقاه في كل ليلة من رمضان فيدراسه القرآن، فلرسول الله صلى الله عليه وسلم أجود بالخير من الريح المرسلة"[2].

---

(1) سورة العلق (1-4).

(2) رواه البخاري (6)، ومسلم (2308).

واتە: "پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەخیترینی خەڵکی بوو. وە لە هەموو کاتێك سەخیتر لەو کاتە بوو کە جبریل علیه السلام لە ڕەمەزان پێی دەگەیشت. وەلە هەموو شەوێکی ڕەمەزاندا پێغەمبەر صلی الله علیـە وسـلم بـە جبریـل دەگەیـشت و قورئـانی بـۆ دەخوێنـد و پێداچوونەوە و دیراسەی دەکرد، بەڕاستی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە ( با)یێك کە بە خێر نێررابێت، سەخاوەتو خێری زیاتر بوو".

لە عائیشەی دایکمانەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەڵیّ: "لا أعلم رسول الله صلى الله عليه وسلم قرأ القرآن كله في ليلة، ولا قام ليلة حتى الصباح، ولا صام شهراً كاملاً قط غير رمضان"[1].

واتـە: "نـەمزانیوە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم لـە شـەوێکدا هـەموو قورئـانی خـەتم کردبـیّ، وە تـا بـەیانی شـەونوێژی کردبـیّ، وە مانگێکی تەواو بە ڕۆژوو بووبیّ، جگە لە مانگی ڕەمەزان".

عن عبدالرحمن بن عبدالله بن مسعود عن ابيه، أنه كان يقرأ القرآن في رمضان في ثلاث. [2].

واتە:( لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود لەباوکییەوە کە لەمانگی ڕەمەزاندا هەموو سیّ شەو جارێك خەتمێکی دەکرد).

كان مالك رحمه الله:"إذا دخل رمضان ترك قراءة الحديث ومجالس العلم وأقبل على قراءة القرآن من المصحف[3].

---

(1) رواه النسائي في السنن (1641) وفي الكبرى (421/1).

(2) أخرجه أبو عبيد (ص78)، وابن نصر في قيام الليل (ص155)، والفريابي (132)، والطبراني في الكبير(8706/9) واسناده حسن.

(3) مجالس شهر رمضان لمحمد بن صالح العثيمين (ص32).

واتە: مالیکی کوڕی ئەنس ڕەحمەتی خوای لێ بێ :"ئەگەر بە مانگی ڕەمەزان گەیشتبوایە وازی لە خوێندنەوەی فەرموودە و کۆڕی زانست و زانیاری دەهێنا و ڕووی دەکردە خوێندنەوەی قورئان لەسەر موصحەف".

كان الزهري رحمه الله: "إذا دخل رمضان يقول: إنما هو تلاوة القرآن وإطعام الطعام" [1].

واتە: زوهری ڕەحمەتی خوای لێ بێ: ئەگەر گەیشتبوایە مانگی ڕەمەزان دەیگوت:"ئەم مانگە تەنها بریتیيە لە خوێندنەوەی قورئان و خواردن بە خەڵکی دان".

كان ابو حنيفة رحمه الله:"يختم القرآن في رمضان كل يوم مرتين، مرة في النهار ومرة في الليل" [2].

واتە:( ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە هەموو شەو و ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزاندا دووختەمی دەکرد، یەکێکیان بە شەو و ئەویتریان بە ڕۆژ).

عن سلام بن أبي مطيع: (أن قتادة بن دعامة كان يختم القرآن في كل سبع ليال مرة، فاذا جاء رمضان ختم في كل ثلاث ليال مرة، فاذا جاء العشر ختم في كل ليلة مرة) [3].

واتە: سەلامی کوڕی ئەبی موتیع دەڵێ: "قەتادە ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە هەر هەفتەیەکدا خەتمێکی دەکرد، جا ئەگەر مانگی ڕەمەزان هاتبوایە لە هەر سێ شەو جارێك خەتمێکی دەکرد، وە لە دە شەوی کۆتایی هەموو شەو خەتمێکی دەکرد".



(1) مجالس شهر رمضان لمحمد بن صالح العثيمين (ص34).

(2) إقامة الحجة لمحمد عبدالحيّ اللكنوي (ص76).

(3) صفة الصفوة لابن الجوزي (174/3).

9

**کان إبراهیم النخعي رحمه الله:(یختم القرآن في رمضان في کل ثلاث لیال وفي العشر الاواخر في کل لیلتین)[1].**

**واتە: ئیبراهیمی نەخەعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ: (لە ڕەمەزاندا لە هەر سێ (3) شەو جارێك خەتمێکی دەکرد، وەلە دەیەکانی کۆتاییدا لە هەر دوو(2) شەو جارێك)[2].**

**وعن ابي عبدالله البخاري صاحب(الصحیح):(انه کان یختم في اللیلة ویومها من رمضان ختمة)[3].**

**واتە: لە بوخاریيەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ:(کە لە مانگی ڕەمەزاندا لە هەر شەوو ڕۆژێکدا خەتمێکی قورئانی دەکرد).**

***لە کۆتاییدا لە خوای نزیك و نزا وەرگر داواکارم کە ئەوەی نووسیومە بەبەزەیی خۆی قبوڵی بکاو لە ڕۆژی دوایی لەژێر دروشمی ( لتکون کلمة الله هي العلیا ) ڕام گرێ ... وە پاشان بووبێتە هۆی ئامادەباشی و عەزم و جەزمی ئێوەی بەڕێزیش بۆ لەبەرکردن و زیاتر کارپێکردنی قورئان.***

**وصلّ اللهم وسلّم على نبیّنا محمد وآخر دعوانا أن الحمد لله ربّ العالمین**

---

(1) مجالس شهر رمضان للعثیمین (ص32).

(2) کەواتە پێویستە ئەوە بزانین: کە زۆربەی دانیشتن و کۆبوونەوەی خەڵکانی ئەمڕۆ لە مزگەوتەکان لە دە (10) شەوەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزان پێچەوانەی ڕەوشت و ڕەفتاری پڕ لە تەقوا و ئیمانی پیاوچاکانی پێشووە، بەوەی کە زیاتر بەرنامەڕێژی بۆ ووتار و پرسیار و وەڵام و قسەی تر دەکرێ لە جیاتی فێرکردن و خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئان.

(3) فضائل القرآن لابن کثیر (ص260).

# ناوەڕۆك


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشكەش | 5 |
| سوپاس و پێزانین | 6 |
| پێشكەش كردن | 7 |
| پێشەكی | 9 |
| ڕێ خۆشكردن | 13 |
| بەشی یەكەم: لەبەركردنی قورئانی مەزن | 15 |
| خاڵی یەكەم: دەروازە | 16 |
| بابەتی یەكەم: دەماخ (الدماغ) | 17 |
| بابەتی دووەم: بیرو هۆش و یاد (الذاكرة) | 19 |
| بابەتی سێیەم: ووزە و توانای مرۆڤ | 22 |
| خاڵی دووەم: لەبەركردنی قورئانی مەزن پێش هەموو كارێك | 24 |
| خاڵی سێیەم: فەزڵی لەبەركردنی قورئانی مەزن و هەڵگرانی | 28 |
| خاڵی چوارەم: قورئان و منداڵ | 39 |
| 1- كەی دەست دەكرێت بە فێركردن و لەبەركردنی قورئان بۆ منداڵان؟ | 39 |
| 2- هۆكارە پاڵنەرو هاندەرەكانی لەبەركردنی قورئانی مەزن بۆ منداڵان | 41 |
| 3 هەڵگرانی قورئان لە منداڵان | 45 |

خاڵی پێنجەم: کێ شایستەترە بەرنوێژی بکا؟ 47

بەشی دووەم: چەند بنچینە و پاسایەکی سەرەکی بۆ لەبەرکردنی قورئانی لێزان و کاربەجێ 53

1. دڵسۆزی و تەنها خوا مەبەست بوون کلیلی کرانەوەی بەخششەکانی خوایە لە دونیا و سەرفرازییە لە دواڕۆژ 53

2. لەبەرکردن لە بچووکی و منداڵییەوە وەکو نەخشی سەر بەرد وایە 54

3. هەڵبژاردن و دیاری کردنی کاتێکی لەبارو گونجاو بۆ لەبەرکردن 56

4. هەڵبژاردن و دیاری کردنی شوێنێکی شیاو بۆ لەبەرکردن 59

5. چاك خوێندنەوەی قورئان و بە ئاوازێکی خۆش و بەدەنگێکی بیستراو ئایەتەکان دامەزراوتر دەکات لە بیروهۆش 60

6. لەبەرکردنی قورئان لەسەر یەك جۆرە چاپ 62

7. پەیوەست بوون بە مامۆستایەکی قورئان لەبەر 62

8. باش خوێندنەوەی قورئان و ڕاست کردنەوەی هەڵەکان 64

9. پەیوەندکردن و بەستنەوەی ئایەتەکان بە یەکتری 66

10. لەبەرکردنی هێواش و لەسەرەخۆ و ڕەچاوکردنی پلەپلەیی باشترە لە لەبەرکردنێکی بە تەکان و خێرا و بە پەلەپەل 68

11. لەبەرکردنی ڕێکخراوو ڕێك وپێکی ڕۆژانە یان هەفتانە چاکترە لە لەبەرکردنی پچڕپچڕ 71

12. کرداری چەند بارەکردنەوە (تکرار) لەبەرکردنە نوێیەکە دەپارێزێ لە لەدەست چوون و لەبیرچوون 72

13. ووردبوونەوە لە ئایەتە وێکچووەکان 73

14. جوان ڕوانین و چاك دیقەتدانی ئایەتەکان لەکاتی لەبەرکردن 77

15. پێکەوە بەستنی کرداری لەبەرکردن بە کارپێکردنی ئایەتەکان و پەیوەست بوون بەفەرمانبەری خواو وازهێنان لە گوناه و تاوان 78

16. پێداچوونەوە و مراجعەی ڕێك و پێك 78

17. تێگەیشتنی هەمەلایەنە و تەواو لە ئایەتەکان یارمەتیدەرە بۆ بەتێر و تەواو لەبەرکردنی قورئان 79

18. هەبوونی هێزی پاڵنەر و ئارەزوویەکی ڕاست و دروست بۆ دەست کردن بە لەبەرکردنی قورئان پێویستە 79

19. هانا بردن و ڕووکردنە خوا بە پاڕانەوەو نوزانەوەو لالانەوەو داوای یارمەتی کردن بۆ ئاسان کردنی کرداری لەبەرکردن 81

بەشی سێیەم: ڕێگاکانی لەبەرکردنی قورئانی مەزن 83

1 لەبەرکردنی قورئانی مەزن لە ڕێگەی مزگەوت و سەنتەرەکانی فێرکردن و لەبەرکردنی قورئان 83

2- لەبەرکردنی قورئانی مەزن لە نێوان دوو کەس 84

3- گوێ گرتن لە تۆمارکەر (مسجل) 85

4- لەبەرکردنی قورئان بەڕێگەی نووسین 90

5- لەبەرکردنی قورئان بە ڕێگەی پێشبڕکێ و هاندان و خەڵات و پاداشت پێدان 91

6- بەستنەوەی کرداری لەبەرکردن بە ڕووداوی گرنگ و کاریگەر 95

7 بەستنەوە و یار و هاودەم کردنی کرداری لەبەرکردنی ئایەت و سورەتەکان بە کاتێکی تایبەت 98

8- بەستنەوە و یار و هاودەم کردنی لەبەرکردنی ئایەتو سورەتەکان بە سەردان و شوێنێکی تایبەت 99

9- لەبەرکردنی قورئانی مەزن لای کوێر و نابیناکان 99

**بەشی چوارەم: هەنگاوە سەرەکییەکان بۆ لەبەرکردنی قورئان** 103

1. شەیداو ئارەزوومەندی (هەبوونی پاڵنەری خۆیی) 104

2. پشت بە خوا بەستن و پاشان متمانە بەخۆ بوون 106

3. ئامانجت دیاری بکە! 108

4. سوودو قازانجت لە لەبەرکردنی قورئانی مەزن دیاری بکە 108

5. دەست بکە بە کێشانی نەخشەیەك و دانانی بەرنامەیەك بۆ لەبەرکردنی قورئانی پایەدار 109

6. وا بێنەپێش چاو و خەیاڵت کە تۆ گەیشتی بە ئامانجەکەت و یەکێکی لەوانەی قورئانیان لەبەرە 111

7. گەیشتن بە لەبەرکردنی قورئان بە هیمەت و وورە بەرزی پاڵپشتی بکە 112

8. یەکسەر دەست بکە بە لەبەرکردن و مەڵێ ئەمڕۆ نا سبەی 112

**بەشی پێنجەم: پچڕاندن و شکاندنی کۆت و زنجیرەکان** 113

1 سەرقاڵم و کاتی تەواوم بەدەستەوە نییە 115

2- زەینم زۆر پەرش و بڵاوە و ساف نییە، وە تەرکیز و ووردبوونەوەم بە دیقەت نییە 116

3- هەر کاتێک دەست بکەم بە لەبەرکردنی قورئان دوای ماوەیەک دووچاری سستی و ساردی و بێزاری دەبم 117

4- تەمەنم گەورەیە و تازە بە جێماوم؛ لەبەرکردنیش تایبەتە بە منداڵ و گەنجەکان 119

5 لەبەرکردنی قورئان بەهرەیەکی خوایە و خوا کێی بوێ بۆ ئەم کارەی ئەو هەڵدەبژێرێ 120

6- لەبەرکردنی قورئان کارێکی زەحمەتە 120

7- هەرکاتێک بمەوێ قورئان لەبەربکەم کەس و کار و هاورێیەکانم ساردم دەکەنەوە 122

8- بیروهۆشم بێهێز و لاوازە، هەر کاتێک قورئان لەبەردەکەم لەبیرم دەچێتەوە 123

9- من قورئانی مەزن لەبەرناکەم لە ترسی ئەوەی نەوەکو لەبیرم بچێتەوە، چونکە ئەمە تاوانە 126

10- قورئانی مەزن لەبەرناکەم نەوەکو تووشی ڕیایی و بەرچاوی بم 127

**بەشی شەشەم: ئاداب و ڕەوشتەکانی هەڵگری قورئان** 129

**بەشی حەوتەم: پێداچوونەوە و دووبارەکردنەوەی قورئان** 147

پێداچوونەوەی تاکی 147

پێداچوونەوەی دووانی 150

| | |
|---|---|
| بەشی هەشتەم: ئەو خواردن و خواردنەوانەی بیروهۆش بەهێز دەکەن و یارمەتی درەنگ لەبیرچوونەوە دەدەن | 151 |
| بەشی نۆیەم: خوێندنەوەو خەتم کردنی قورئان لە مانگی ڕەمەزان | 155 |
| ناوەڕۆک | 161 |



# سەنتەری حیکمە

بۆ فێر کردن و پێ لەبەرکردنی قورئـانی پیرۆز

**پێناسە/** دامەزراوەیەکە هەڵدەستێت بە کاری فێرکردن و پێ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بۆ گشت چینەکانی کۆمەڵگا و هەر هۆکارێك کە یارمەتیدەر بێت بۆ نزیك خستنەوەیان لە قورئان و نزیك خستنەوەی قورئان لێیان.

## لە ئامانجەکانی/

1 . گرنگی دان بە فێرکردنی قورئان و چاك خوێندنەوەو لەبەرکردنی.

2 . ڕوون کردنەوەو ڕاڤەکردنی ماناکانی قورئان و دەرخستنی موعجیزە زانستی و زمانەوانی و دەروونی یەکانی.

3 . چەسپاندن و قوڵ کردنەوەی بنەماکانی ئیمان و حەقیقەتی ئیسلام لە دڵ و دەروونی هەڵگرانی قورئان، ئەمەش لە ڕێگەی دەست گرتن بە ئایەتەکانی و وەستان لە ئاست حوکمەکانی و کار پێ کردنی.

4 . ڕاهێنانی زمان و بەهێز کردنی لەسەر شێوازی قورئان و گرنگیدان بە زمانی عەرەبی.

5 . گرنگیدان بە تواناکانی مامۆستایان بۆ بەدەست هێنانی مۆڵەت (اجازە) لە خوێندنەوەی ڕاست و دروست.

6 . هەوڵی بەردەوام بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی بە بابەتە قورئانی یەکان.

**نرخی (2000) دینارە**